

# ژیانەکانی پێشو

# و

# یاداشتەکانی رۆح







نوسینی : د. برایان لیسلی وایس

وەرگێرانی : هێمن شەریف

# ژیانەگانی پێشوو

# یاداشتەکانی




نوسینی: د. برایان لسلی وایس

وەرگێڕانی: هێمن شەریف

ناو نیشانی ئەم کتێبە بە ئینگلیزی

Many lives; Many Masters;

C١٩٩٦.

BRIAN L. WEISS M.D.

ناو نیشانی ئەم کتێبە بە فارسی

زندگی های گذشته و دسترسی به خاطرات روح

نویسنده: دکتر برایان

مترجم: فرهاد کاظمی

نشر : حم ١٣٨٤

او نیشانی بەکوردی

ژیانەکانی پێشوو یاداشتەکانی ڕۆح

و. هێمن شەریف حەسەن

سلێمانی ٢٠٠٦

ئای خۆزگە ببوایە جێگا بۆ سانەوەیەک

م ڕێگەیە دورە سورو پێچدانەوەیەک

سەد خۆزگە لەپاش نەمان وەکو سەوزەگیا

بکرایە لەگەڵ ئومێدی هەڵدانەوەیەک

خەییام

**لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی**

**چوارچرا**

Email \ cwarcra_slemani@yahoo.com

Mobile \ ٠٧٧٠ ١٥٧٥٠٦٧

٠٧٤٠١١٢٨٤٨٨

ناوی كتێب: ژیانەكانی پێشوو یاداشتەكانی رۆح

بابەت: فەلسەفی و دەروونی

نوسینی: د. برایان لیسلی وایس

وەرگێڕانی بۆ فارسی: فرهاد كازمی

وەرگێڕانی بۆ كوردی: هێمن شەریف

Sharefhemin@yahoo.com

پیت چنین: هێمن شریف ، وزیره مستەفا

هەڵەگرو ڕێنوس: م. دیار حامد

كلێشەساز: وەرگێر

چاكسازی بەرگ: فەرهاد فایەق

خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی چوارچرا

ژمارەی سپاردن:( ٩٩٠ )ی ساڵی ( ٢٠٠٥ )

چاپی یەكەم ٢٠٠٦

تیراژ: ١٠٠٠دانە

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە .

# پێڕست

بەناوی پەروەدگار

**دکتۆر برایان پزیشکێکی دەروونی بەناو بانگی ئەمریکییە. ناوبراو بەرپرسی بەشی دەروونی زانکۆی ( میامی ) بووە لە فلۆریدا. لەو یەکەم پزیشکانەیە لەرێگەی یاداشتەکانی پێشووەوە رەوشێکی چارەسەری نەخۆشی دەروونی تاقیکردەوە بەشێك لە ئەزمونە نوێکانی ئەو لەم کتێبەدا هاتووە.**

**ئەم توێژینەوە زانستییە لە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکاندا تا رادەیەك نوێیەو رەنگە زیاتر لەدە ساڵ بەسەریا تێنە پەرێت، ئەمەش توێژینەوەیەکی زانستییەو جیاوازە لەگەڵ ئەو توێژینەوە تەقلیدیانەی دەربارەی ژیانی پاش مردن کراون. چەند ها تیۆری زانستی جیاواز لەبارەی چۆنییەتی .بوونی ئەم یاداشتانە خراونەتە روو، وەتوێژینەوە زانستییەکانیش لەژانرە جیاوازەکانییەوە لەم مەیدانەدا بەردەوامن و روو لە زیاد بوونن.**

**ئاڵۆزییەکانی زەین و، ئاناگایی و رۆح و دەروون هێشتا لەرووی زانستیەوە بەتەواوی ناسراو نین و سەرچاوەکانی زانیاری و بیرەوەرییەکانی رۆح زۆر نادیارو ئاڵۆزو نامۆن.**

**دەیان ناوەندی توێژینەوەی زانستی و زانکۆ لەرۆژئاوادا بەهاوکاری ژمارەیەك لەبەرجەستەترین و بەناوبانگترین**

پزیشکانی دەروونی دوای ئەم توێژینەوە کەوتوون لە پێناو زیاتر ناسینی ڕەهەندە جیاکانی . بۆئەم ڕەوتە زانستییەو کاریگەربوونی ئەم ڕەوشە لە چارەسەرکردن بەسە تەنها ئاماژە بە بوونی ( ٥٠٠٠ ) کلینکی دەرمانی و چارەسەرکردن لەڕابردوودا لەئەمەریکادا بکەین.

ئامانج لەوەرگێڕانی ئەم کتێبە تەنها لەبەر بوونی دەقێکی متمانە پێکراوی زانستییە لە باسێکی نوێدا و پاشانیش دەتوانێ بەنرخ بێت بۆ کەسانێك کە خولیاو سوسەکەرن لەزانستی ڕۆح و دەروونناسی و بوارەکانی پەیوەندی بەوەوە. جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کەبیرو ڕاکانی ئەم کتێبە بەهیچ شێوەیەك هیچ بیرو باوەڕێك و ئاینێکی لە پشتەوە نییەو پەیوەندی نییە بەهیچکام لە ئاینەکانی ڕۆژهەڵات وەکو ( بودیسم ) کە دەربارەی هاتنەوەی ڕۆح بۆلاشە دەدوێ. وەرگێڕی ئەم کتێبەش لەڕوی بیرو باوەڕەوە ئەم کتێبەی نەکردووە بەکوردی و ڕەنگە لەگەڵ بیرو باوەڕیشیدا هاوخوان نەبن و تەنها لەڕوی ئەمانەتەوە کردوویە بەکوردی. بەهیواین لەداهاتودا" بەم کتێبەشەوە" چەند توێژینەوەیەکی دی بەزمانی کوردی بەچاپ بگەیەنین تائەم باس و خواستانە لەلامان نامۆ نەبن.

خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا سلێمانی ٢٠٠٦

# پێشەکی نوسەر

ئەزانم بۆ هەرشتێك هۆکارێك هەیە . رەنگە لەساتی روودانی هەر شتێکدا تواناو زانستی دەرککردنیمان نەبێت بەلآم بەتێپەڕینی زەمەن و سەبرو حەوسەڵە باشتر دەبێ .

دەربارەی ( کاترین ) یش هەرواها بوو . یەکەمجار لەساڵی ١٩٨٠ وەختێ بیست و حەوت ساڵ بوو بینیم . بۆ چارەسەرو وەدەرنانی نیگەرانی و ترسەلە خۆراکانی هاتبووە عیادەکەم . هەرچەندە هەر لەمناڵیەوە ئەمانەی لەگەڵدابوو بەلآم بەم دواییانە توندتر بووبوون . ڕۆژ بەڕۆژ بەوەی ئەزانی کەهەستە ~انی ناهاوسەنگ و بێ هەست دەبوون .

لەگەڵ بوونی ئەو پەرێشانیە زۆرەی کەلەو زەمەنە وە بەسەر ژیانیدا زاڵ بوو ، ژیانی من خولگەی ئارامی خۆی تەی دەکرد. ژیانێکی هاوبەشی پتەو و دوو منداڵی لاو و سالارم هەبوو .

هەر لەسەرەتاوە ژیانم رەوتێکی بێ پێچ و پەنای هەبوو . لەخێزانێکی پڕ ـەسۆزو خۆشەویستیدا گەورەبووم . بەئاسانی چومە زانکۆو لەساڵی دووەمی زانکۆ بڕیارمدا ببمە پزیشکی دەرونی .

لەساڵی ١٩٦٦ بە نمرەی بەرزەوە زانکۆی ( کۆلۆمبیا ) م لە( نیویۆرك ) تەواو کرد . پاشان چومە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی ( ییل ) Yaleوبڕوانامەی دکتۆرام لەساڵی ١٩٧٠ هێنا . لە پاش کۆتایی هاتنی قۆناغی فێرکاری لەناوەندی پزیشکی زانکۆی ( بیلیڤوی )، وە بۆ تەواوکردنی خولی وەرزی

لە پزیشکی دەروونیدا چوومە زانکۆی (ییل) . پاش تەواو بونی ئەم خولە بوومە بەرپرسی بەشێك لەزانکۆی ( پیتزبوك ) . دووساڵ دوای ئەوە بوومە بەرپرسی بەشی (ناسینی دەرمانە ڕۆحی و دەرونیەکان ) لە زانکۆی میامی . وەختێ لەم زانکۆ بوم ناوبانگی جیهانم دەرکرد لەبەشەکانی دەروونی و ژین ناسی و خراپی بەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر . پاش چوار ساڵ چالاکی زانکۆ بوومە مامۆستای پزیشکی دەروونی لە کۆلێژی پزیشکی و بە پرسیاریەتی بەشی دەروونی یەکێك لە نەخۆشخانە گەورەکانی سەر بە زانکۆ لەشاری میامی گرتە ئەستۆ . تا ئەوساتە لە بوارەکەی خۆمدا سی وحەوت وتاری زانستی و کتێبم بلاو کردبووەوە .

بەرەنجامی ساڵانێك موتالای پلان بۆدانراو زەینمی بەچەشنێ فێر کردبوو کەوەك زانایەك و پزیشکێ بیر کەمەوەو پسپۆری خۆم بپارێزم . هەر شتێ کەبە ڕەوشە زانستیەباوەکان نەدەسەلما باوەڕم پێ نەدەکرد . ئاگاداری هەندێ توێژینەوە لەبواری دەروونناسی دابووم کەلەزانکۆ گەورەکان بەسەرانسەری ولاتدا ئەنجام دەدرا بەلام هیچ کام بەوانە سەرنجمی ڕانەدەکێشان . بەڕای من نازانستی بوون .

پاشان (کاترین) م دی . ماوەی هەژدە مانگ سودم لەدەرمانە باوەکان وەرگرت بۆ چارەسەرکردنی، وە لەبەرئەوەی هیچ بەرهەمێکم نەبوو ڕووم کردە هیپنۆتیزم . کاترین لەخەواندنی هیپنۆتیزما هەندێ بیرەوەری لەژیانی پێشوی بیرهاتنەوە کە دەرکەوت هۆکاری دروستبوونی ناڕەحەتیەکانی ئەون . لەم دۆخانەدا ئەیتوانی وەك کەناڵێکی زانیاری (ڕۆحی) زۆر پێشکەوتوو کار بکات و زۆر نهێنی مەرگ و ژیان لەڕێگەی ڕۆحەکانەوە ئاشکرا بکات . لە پاش چەند مانگێك ناڕەحەتیەکانی نەمان و

توانی ژیانێکی پڕ لەخۆشی و شادی و ئارامی کە پێشتر بۆی ئەستەم بوو دەست پێبکات .

من ئامادەیی ئەم ڕووداوانەم نەبوو وەلەبەرامبەریا دۆش دامابووم .

وەهیچ بەڵگەیەکی زانستیم پێ نیە بۆئەوەی کە ڕویدا . زەینی مرۆڤ کەلەبەری ئاڵۆزو پێچیدەی هەیە کەئەش لە پشت تێگەیشتنی ئێمەوەیە . لەژێر کاریگەری هیپنۆتیزما ڕەنگە کاترین توانیبێتی بچێتە ناو بەشێ لە زەینی خۆی کەیادەوەری ڕاستەقینەی ژیانی پێشوو دەپارێزێ ، وەیان ڕەنگە توانیبێتی ڕێگەی ئەو سەرچاوەی هێزە بدۆزێتەوە کەدەوری داوین و تەواوی بیرەوەرییەکانی ئەوەکانی ئادەمییە ، وەك ئەوەی کە( کارل یونگ ) بە ( ئاناگایی گشتی ) ناوی دەبات.

زانایان دەستیان دایە توێژینەوە بۆ وەچنگ هێنانی ئەم وەڵامانە . ئێمە وەك کۆمەڵگایەگ ^ێندە زانستمان دەربارەی نهێنی زەین ، ڕۆح ،و بەردەوامی ژیانی پاش مردن وئاسەواری ئەزمونەکانی ژیانی پێشوو لەسەر هەڵسو کەوتی هەنوکەی خۆمانێ نییە . پێویستە لەم مەیدانانەدا توێژینەوە بکرێ . بەهەر حاڵ توێژینەوەی زانستی وردو درشت لەم زەمینەدا لەسەرەتای ڕێدایە . لە پێناو دەرخستنی ئەم شتانە هەوڵێکی زۆر دەدرێت ، بەلام پێشکەوتوونین . زانایان و خەڵکی ئاسایش لەبەرامبەریا مەیل نادەن و بەرگری دەکەن . هەر لەسەرەتای مێژووەوە ، مرۆڤ لەبەرامبەر گۆڕان و وەرگرتنی بیروباوەڕی نوێدا بەرگری کردووە . مێژووی فەرهەنگی ئێمە پڕن لەم نمونانە . وەختێ ( گالیلۆ ) هەسارەی موشتەری دۆزییەوە ، ئەستێرە ناسەکانی ئەودەمە ئامادە نەبوون قایل بن یان تەنانەت لێشی بکۆڵنەوە چونکە پێچەوانە بوو لەگەڵ بیروو باوەڕیاندا .

ئێستەش دەروونناسان و پزیشکانی دی هەڵدێن لەدراسەکردن و لێکدانەوە دەربارەی ژیانی دوای مردن و بیرەوەرییەکانی ژیانە کۆنەکان . وەکو خەڵکی سەردەمی گالیلۆ هەڵسو کەوت دەکەن و توند چاوەکانیان دەگرن .

ئەم کتێبە بەشێکی کەمی منە لە توێژینەوە لە زەمینەی ( دەروونناسی ئەزمونی ) . بەتایبەت لەبوارێکدا کە پەیوەندی بەئەزمونەکانی بەر لەدایکبوون و پاش مردنەوە هەیە.

هەر وشەیەك لەم کتێبەدا دەیخوێنییەوە ڕاستەقینەن . من هیچم پێوە نەناوە . تەنها ئەو باسانەی کەدووبارە بون لام بردوون و شوناسی کاترینیش لە پێناو دڵنیابوون لە پاراستنی نهێنی تا سنورێك گۆڕیومە .

چوار ساڵی پێ چوو تا بنووسم دەربارەی ئەو شتەی کە ڕوویدا .

ڕاستیەکەی پێویستم بەم ماوە هەبوو تابتوانم غیرەتێك بێتەگیانم لە پێناو دەرخستنی ئەم زانیاریانەی کە پسپۆڕییەکەمی دەخستە مەترسیەوە .

شەوێك کتوپڕ لەکاتی خۆشتندا ، هەستم کرد ناچارم ئەم ئەزمونە بخەمە سەر کاغەز . هەستێك توند دایگرتم کەوەختی گونجاو هاتووەو ئیتر نابێ ئەم زانیارییانە لەخەڵك بشارمەوە . ئەو وانانەی فێری بووبووم، ئەبوو فێری خەڵکیم کردبایە. ئەوانە بەتەنها بۆ من نەبوون .

ئەم زانستە لەڕێی کاترینەوە هاتبون و دەبوو لە ڕێگەی منەوە بڵاو بێتەوە. ئەمزانی زیانەکانی شاردنەوەی ئەم زانیاریانە دەربارەی مانای ڕاستەقینەی ژیان و جاویدان بوونی زیاترە لە چاو بڵاوکردنەوەیاندا .

بە پەلە لەحەمام هاتمەدەرو ئەو کاسێتانەی کەتۆمارم کردبوون لەدانیشتنەکانم لەگەڵ کاترین هەڵمگرت و لەسەرمێزی کارمکەم دانیشتم

**. نیوەی شەوان ، وە بیری باوە گەورەی ( مەجارستان ) یم دەکەوتم وەختێ نەوجەوان بووم مردبوو . هەرکاتێ پێم دەوت لە دەسپێکی کارێك دەترسم کەنەزانم دمرەنجامەکەی باشە یان خراپ ، بە دووبارە کردنەوەی پەندە ئینگلیزیە هۆگریەکەی شەهامەتی دەدامێ و دەیگوت : (( هەرچی ئەبێ با ببێ )) .**

بۆیەکەمجارکە(کاترین)م بینی، بلوزێکی سورمەیی لەبەردابوو. لەبارێکی زۆرنائارامدالەهۆبەی چاوەڕوانی لەعیادەکەمدالاپەڕەی گۆڤارێکی ئەمدیودیودەکرد.. هەناسەی توندبوو، چونکە بیست خولەکێك دەبوو چاوەڕوانی دەکردم ئەمەلەکاتێکدا کەبەزۆر خۆی ڕازی کردبوو لەو وادەیەی دیاریمان کردبوو ئامادەبێت و هەڵنەیەت . لەسالۆنی بەشی (شیکەرەوەی دەروونی) دەهات ودەچوو.

بۆسلاوکردن و بەخێرهاتنی چومەهۆبەی ناوبراو و تەوقەمانکرد. دەستەساردوو سڕەکانی لەپەرێشانی و نیگەرانییەکانی دەدوان. دوومانگی خایاـبوو تابتوانێ وادەی دیدار دابنێ. لەم ماوەیەشدا دووان لەپزیشکانی نەخۆشخانە ڕێنومایی منیانک وو دەربارەی کاترین.

کاترین ژنێکی سەرنجڕاکێش ، چاوەکانی ڕەش و قژکاڵ.. ئەوکات وەکو بەردەست و یاریدەدەری پزیشکان لەتاقیگەی ئەونەخۆشخانەیەی کەمن بەرپرسی بەشی دەرونی بووم ئیشی دەکرد و داهاتێکیشی دەستدەکەوت. خولکمکرد بێتە نوسینگەکەم . لەقەنەفەکان ڕەتبوین و لەسەر کورسییەك دانیشت. هەرچەند مێزە نیوەبازنەییەکەم مەودایەك بوو لەنێوانماندا تا لەبەرامبەر یەك دانیشتین. پاڵی بەکورسییەکەدابووەوەو ئارام، نەیدەزانی لەکوێوە دەست پێبکات. من چاوەڕوانی ئەوەبووم خۆی دەستبکات بەگێڕانەوەی شتەکان پاش چەند خولەکێ پرسیارم دەربارەی

ڕابردووی لێکرد. هەرلەیەکەم بینیندا دەمویست بزانم ئەوکێیەو بۆچی هاتووە بۆلام.

لەوەلامی پرسیارەکانمدا چیرۆکی ژیانی خۆی بۆگێڕامەوە. منالی ناوەنجی خێزانێکی موحافیزکاری کاتۆلیك بوو. لەشارۆچکەیەك لەویلایەتی (ماساشوست) گەورەبووبوو. برا وەرزشەوانەکەی کەسێ سالْ لەوگەورەتربوو خاوەنی ئازادییەکی زۆربوو بەلام ئەوئازادییە بەکاترین نەدەدرا. خوشکە چکۆلانەکەشی نازداری دایەو بابەبوو.

وەختێ دەربارەی هۆیەکانی نەخۆشییەکەی دواین پێیناخۆش و توڕەبوو! بەڕەقی دەدوا.. خۆیدا بەپێشداو ئانیشکەکانی خستە سەر مێزەکە . ئەو بەدرێژایی ژیانی لەگەلْ ترسا سەروکاری هەبووە. لەناو دەترسا.. لەخنکان و تاسان دەترساونەیدەتوانی حەبەکانی قوتبدات. لەفڕۆکەدەترساو، لەتاریکی و سلێشی لەمردن دەکردەوە بەم دواییانەترسەکانی پتربووبوون. لەپێناوئەوەی کەزیاتر هەست بەئەمنییەت بکات لەژوورێکی بچوکی ئاپارتمانەکەیدا دەنوست. تاچاوەکانی دەچونە خەو دوو سێ کاژێری دەخایاند. دیسان توشی کابوسەکانی شەوانەو ، شەوڕەویی کەلەمندالیا ئەویان هەراسانکردبوو بووبوو. تادەهات ترس و پالنەرەکانی نەخۆشییەکەی پتر ژیانی تێك دەداو زیاتر مەلول دەبوو.

بەوچەشنەی کەدەدوا نەمتوانی پەیی پێبەرم تاچ سنورێ بەدەم ئازارەوە دەتلێتەوە. لەچەندسالی ڕابدوودا یارمەتی نەخۆشێکی زۆرم دابوو تا بەسەرترسەکانیاندا زالبن و دلنیاشبووم کەدەمتوانی یارمەتی کاترین بەم. بڕیارمدا لەژیانی مندالییەوە دەستپێبکەم و وەدوی سەرچاوەی سەرەکی گرفتەکانیدا بگەڕێم چونکە بەزۆری ئەم ڕەوتە

دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ترس و نیگەرانی. ئەگەر پێویستی بکردبایەو بیتوانیبا حەبەکان قوت بدات ئەمتوانی دەرمانی ئارامکەرەوەی بۆبنوسم . ئەم دەرمانانە ستاندارن بۆ ئەم چەشنە نەخۆشیانە، منیش قەت دوودڵنەبووم لەپێدانی بۆنەخۆشەکان . بەڵام ئێستە ئەگەر بۆشی بنوسم بەکاریان بێنی ئەوا کاتییە. هیچ دەرمانێك ناتوانێت هەڵسوڕێنەری بنەڕەتی ئەم نەخۆشیانە ریشەکێش بکات ، ئەزموونم لەگەڵ کاترین و نەخۆشەکانی ترم ئەمەیان بۆسەلماندووم. ئێستەدەزانم لەگەڵ بوونی دەرمانە بەسودەکان، سەرکوتکردنی نەخۆشی و لەناوبردنی پاڵنەرەکانی بێمانایە.

بەدرێژایی دیداری یەکەم هەوڵم دا بیگەڕێنمەوە بۆ سەردەمی منداڵی. هەندێ ڕوداوی کەمی بەبیرداهات لەو وەختەدا بەبیرماهات وەکو ڕێگایەکی چ' ەسەر بە(هیپنۆتیزم) شیبکەمەوە. بەڵام هیچ بارو ًخێکی تایبەت کەبتوانێ دەربڕی ترسەکانی، بێت وەبیر نەدەهات. هەوڵی دەدا و زەینی خۆی دەخستە ژێر فشارەوە ، هەندێ کەلەبەرو یادەوەری ژیانی منداڵی دەرکەوت ، ئەوکاتەی کەپێنج ساڵان بوو یەکێ لەقەراغ حەوزەکەوە هەڵی داوەتە ناو ئاوەکەوەو ئەویش توشی ترسێکی زۆر بووبوو. وەدەیگووت کە تەنانەت بەرلەوەش هەر زۆر کەیفی لەئاو نەهاتووە. کاتێك یازدە ساڵان بووە دایکی دووچاری نیگەرانییەکی زۆر هاتووەو بەردەوام گۆشەگیرو غەماوی بووە . پاشان براوەتەلای پزیشکی دەروونی و بەهۆی بەکارهێنانی دەرمانی زۆرەوە توشی شەوکەو کەئابە بووە. ئەم بارەی دایکی کاترینی زۆر ترساندبوو، بەڵام هەرواکەدایکی باش دەبوو و دەهاتەوە سەرخۆی ترس و بیمەکانی کاترینیش لەناودەچون. باوکی

ئالودەی (مەی) بوەو هەندێجار براکەی ناچاربووە بەوەی باوکی لەمەستیدا لەبارەکەی نزیکی خۆیان بۆماڵ بهێنێتەوە. زۆرخواردنەوەی مەی لەلایەن باوکیەوە دەبووە هۆی ناکۆکی و ئاژاوە لەگەڵ دایکیدا، ئەمیش لەم دۆخە نالەبارەدا ناهەموار بووەو لەخێزانەکەیدا گۆشەگیری هەڵبژاردووە.

بارودۆخی لەدەرەوەی ماڵ باشتربووە.. لەقوتابخانە چەند هاوڕێیەکی هەبوو پێکەوە هەڵسو کەوتیان دەکرد. بەڵام متمانەکردن بەخەڵکی بەلایەوە دژواربوو بەتایبەت بەوکەسانەی کەسەرپێیی دەیناسین.

ئەومەزهەبە دینییەی کەبڕوای پێی بوو هیچ گومان و ئاڵۆزی و دوودڵییەکی لەبارەوەنەبوو. ئەوواگۆشکرابوو کە بڕوای بەکارو ئایدۆلۆژیای کاتۆلیکی سوننەتی هەبێ و ڕۆژێ لەڕۆژان گومانی بەحەقیقەت و ئیعتیبار. ئیمانی نەبردبوو. بڕوای وابوو ئەگەر ئادەمی کاتۆلیکێکی ئیمانداربێت و ڕەچاوی ئاداب و رەسمی مەزهەبی بکات دەچێتە بەهەشت. ئەگەر وانەبێت ئەوا بەرزەخ و جەهەنەم بەچاوی خۆی دەبینێ و پەروەردگارو حەزرەتی مەسیح دوابڕیاری لەسەردەدەن. دواتر زانیم کاترین بڕوای بە (چوونی ڕۆح لەلاشەیەکەوە بۆلاشەیەکی تر ) نەبوو. ئەگەرچی شتی کەمی خوێندبووەوە دەربارەی هیندییەکان بەڵام شتێکی ئەوتۆی لەم چەمکە نەدەزانی. چەمکی تەناسخ "گەڕاندنەوەی دووبارەی ڕۆح بۆ لاشە" لەگەڵ پەروەردەو تێگەشتنی کاترین دوالیزمە بوون. ئەو لەژیانیدا ئەدەبیاتی (دوای سروشت) و (زانستی نادیار) ی نەخوێندبووەوە چونکە بڕوای پێیان نەبوو. ئای چەندە لەسەر بیرو باوەڕی خۆی قایم و قوڵ بوو.

لەدوای قۆناغی ئامادەیی کۆرسێکی دووساڵەی بڕیبوو پاشان بووبووبە بەردەست و هەڵسوڕێنەری کارەکانی تاقیگە . بونی پسپۆڕی لەبوارێکداو گواستنەوەی براکەی بۆ (تامپا) بوەهۆکاری ئەوەی لە(میامی) لەنەخۆشخانەیەکی گەورە کەسەر بە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی (میامی) بوو، سەرقاڵییەك بدۆزێتەوە و لەبەهاری ساڵی ١٩٧٤ لەبیست وچوار ساڵیدا بچێت بۆمیامی.

ژیانی کاترین لە شارۆچکەیەکدا ساناتربوو لە چاو ژیانی لە میامی. بەڵام بەوەی کە لەکێشەی ناو خێزان قوتاری بووبوو زۆرخۆشحاڵبوو.

لەماوەی ساڵی یەکەمی نیشتەجێبونی لە میامی ، سەردانی (ئیشتوارت)ی کرد. ئەو یەهودییەکی خێزاندارو خاوەن دوومنداڵ بوو. ئیشتوارت جیابوو لەهەموو ئەوپیاوانەی کەدەیناسین.. بەڵام دۆستایەتییان پڕ لەواتەوات بوو. شتێك لەناخی دابو کەتاسەی کاترینی دەهەژاندو بێداری دەکردەوە، تەنانەت بەو چەشنە کە دەتووت نوشتەی لێکردووە. وەختێ کاترین دەستی کرد بەچارەسەری خۆی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئیشتوارت پێی نابووە هەشتەمین ساڵییەوە. نەیدەتوانی لەبەرامبەریا بەرگری بکات و ئەویش هەڵسو کەوتی خراپی لەگەڵ دەنوان. کاترین لەدرۆکانی و ، وەفانەکردن بەوادە وپەیمانەکانی و چۆنییەتی هەڵسو کەوتکردنی سەراسیمە بووبوو.

چەند مانگێك بەرلەهاتنی بۆلای من ، بەهۆی لویەکەوە کەلەسەر ژێکانی دەنگی دروست بووبوون ، نۆژداری بۆکرابوو.
بەر لەسڕکردن شڵەژابوو بەڵام دوای نۆژداری تۆقی بوو! ئارامکردنەوەی لەلایەن پەرستارەکانەوە چەندین کاژێری خایاندبوو. دوای

بەهۆشهاتنەوەی لەنەخۆشخانە هەواڵی (ئیدوارد پول)ی پرسی بوو. ناوبراو پسپۆڕی منداڵانە و کاترین لەکاتی ئیشکردنی لەنەخۆشخانە سەردانی کردبوو . هەردووهەستیان کردبوو کە وابەستەیی و تەفاهومێکی زۆریان بۆیەك هەیەو بەم چەشنە پەیوەندییەکی پاك لەنێوانیاندا دروست بووبوو. کاترین بێپەروا لەگەڵ ئیدوارد قسەی کردوە و باسی ترسەکانیو، پەیوەندی لەگەڵ ئیشتوارت و هەروەها ئەوەی کە لەساتی لەدەستدانی کۆنترۆڵی ژیانی دابوو دوابوو. ئیدواردیش پێداگری کردبوو تا بێت بۆلای من و ووتبوی کەتەنها من دەتوانم یارمەتی بدەم.

هەمان کاتیش کە ئیدوارد کاترینی ڕێنمایی کردبوو تا وادەی دیدار دابنێین تەلەفونی بۆمن کردوو ووتی بەهۆی چەند شتێکەوە پێی وایە کە تەنها من دەتوانم پەی بەنهێنی ئەو نەخۆشیەبەرم. بەلآم هەرچۆن بێ کاتر ، تەلەفۆنی بۆمن نەکرد.

دوومانگ تێپەڕی . لەگێرو گاری کارە پڕ لەدەردی سەریەکەمدا لەبەشی شیکەرەوەی نەخۆشی دەرونی، تەلەفونەکەی ئیدواردم لەبیر چووبوو. ترس و نیگەرانییەکانی کاترین پتر بوبون .. دکتۆر(فرانك ئاکر) بەرپرسی بەشی نۆژداری چەند ساڵێك بوو کاترینی دەناسی و کاتێ کەدەچووە تاقیگە گاڵتەو گەپیان دەکرد ئەویش هەستی بە ناڕەحەتی و فشاری کاترین کردبوو.

چەند جارێ داوای لێکردبوو شتێکی پێبڵێ بەلآم نەیوتبوو. ڕۆژێك دوانیوەڕۆ لەرێگای چوون بەرەو کلینکێکی تربووە ، لەڕێگادا کاترین دەبینێ لەسەیارەکەی خۆیدا بەرەو ماڵ کەنزیکی ئەو کلینیکە بوو دەچێ و ئەمیش ئامارەی پیدا کەبوەستێ:

«داوات لێدەکەم هەرئێستا بچیتە لای دکتۆر وایس».

وە لەسەیارەکەی خۆیدا هاواری کردوو وتی: « بەبێ ملە جیرێ !»

زەمەن و ڕێژەی ترس و نیگەرانییەکانی کاترین ڕووی لە زیادبوون دەکرد. دووشەو لەسەریەك کابوسی دیبوو. لەیەکێکیاندا لەکاتێکدا کەبەسەر پردێکدا شۆفێری دەکرد پردەکە ڕوخاو سەیارەکەی کەوتە ناو ئاوەوە و لەوێشدا کەوتە ناوداوێك و وەخت بوو دەخنکا. لەدووەمیاندا لەژوورێکی تەنگەبەردا کەوتبووە داوەوەو بەر شت دەکەوت و هەڵدەساو دەکەوت و نەیدەتوانی دەرباز بێت.

لەیەکەم دیدارم لەگەڵ ئەو نەمدەزانی ژیانم لەئاوەڵابونە و ئەو ئافرەتەی لەوبەر مێزەکەم دانیشتبوو دەبێتە هۆی گۆڕانێکی زۆر و چیدی من ئەوکەسەی پێشتر نابم.

کاترین هەفتەی جارێك یان دووجار ئەهات بۆ دیتنم. هەژدەمانگ بەم چەشنە لەژێر دەرمانێکی زۆردابوو. ئەونەخۆشێکی چاك بوو . زۆر دەدوا و دیدگاکانی بەرزبوون وەزۆر تامەزرۆی چاك بوونەوە بوو.

بەدرێژایی ئەم ماوەیە ، ئێمە لەئیحساسات و بیرو بۆچوون و ڕوئیاکانی دەکۆڵاینەوە توانیبووی بەهەستکردن بەڕەفتارە دووبارەکانی، خۆی بناسێ . کاترین جوزئیاتێکی گرنگترلەڕابردووی وەکو لەماڵنەبوونی باوکە تاجرەکەی و شەڕە توندو تیژەکانی لەدوای خواردنەوەی زۆری مەی وەبیر دەهات. ئەوهەستێکی زیاتری دەربارەی پەیوەندییە پڕلەواتەواتەکەی لەگەڵ ئیش ـ ارت دا لادروست بووبوو، وەخەشمی خۆی لەئاستێکی گونجاوتر دەردەخست. هەستم دەکرد دەبێ زۆر باشتر بوبێ. کاتێ نەخۆشەکان ئاسەوارە ناخۆشەکانی ڕابردوویان وەبیر دێنن ، زەمەنەێك کەفێردەبن رەفتارە نالەبارەکانی پێشویان دەستنیشان دەکەن و پاشان چاکسازی دەکەن و، کاتێ هۆشیاری و زیرەکی فراوان بووەو لەڕەهەندێکی ترەوە دەڕواننە کێشەکانیان، ئەوکات باری دەرونییان باشتر دەبێت بەلأم کاترین هیچ باش نەبووبوو.

هێرشی ترس و نیگەرانی هێشتا عەزابی دەدان، کابوسە ناخۆشەکانی بەردەوام بوون و هێشتا لەتاریکی و ئاوو چونە ناو شوێنە بن بەستەکان دەترسا. نوستنەکانی بچڕ بچڕ بوون و ماندوییەتی نەدەڕەواندنەوە لەگەڵ ئەوەشدا توشی دڵە خورپێ بووبوو.

ئەوکاتانەی لەوەدەترسا بەخواردنی حەب بخنکێ دەرمانەکانی نەدەخوارد. هەستم دەکرد گەشتوینەتە بنبەستێك و هەرچیمان دەکرد نەماندەتوانی لێی دەربازبین. هەستم دەکرد هەوڵەکانم بێبەرهەمن کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر سوربووم لەسەر ئەوەی یارمەتی کاترین بدەم.

وەدواتر شتێکی سەیر ڕویدا. لەگەڵ ئەوەی کەلەسواربونی فرۆکە دەترسا لەبەهاردا بەهاوڕێی ئیشتوارت بۆ بەژداریکردن لەکۆنفراسێکی پزیشکی چوو بۆشیکاگۆ. وەختێ لەشیکاگۆبوون لەسەرداوای کاترین چون بۆ دیتنی مۆزەخانەیەکی میسری. لەمۆزەخانەکە چاودێرێك ڕێنومایی دەکردن و ڕونکردنەوەی لەسەر شتەکان دەدا.

ئەو هەمیشە هۆگری شتە دەسکردەکانی میسری کۆن و ئاسارە دروستکراوەکانی بوو. وەلەژیانیدا موتاڵای ئەو قۆناغەی لەمێژوو نەکردبوو.

کاتێ چاودێرەکەڕونکردنەوەی لەسەرشتە دەسکردەکانی ناوپێشانگاکە دەدا کاترین هەڵەی بۆڕاستدەکردەوەو ڕاستیشی دەکرد. چاودێرەکەو تەنانەت کاترین خۆشی سەری سوڕمابوو. ئەوچون ئەم شتانەی دەزانی ؟ بۆچی هێندە لەڕاستیەو دروستی بۆچونەکانی خۆی دڵنیابوو؟ چۆن هێندەمتمانەی بەخۆی بوو لەبەردەم خەڵکا هەڵەکانی چاودێر ڕاستبکاتەوە؟ پێدەچێ ئەم بیرەوەرییانە پەیوەندی بەمنداڵییەوە هەبوبێ و ئەو پشتگوێی خستبن.

لەدیداری دواترماندا پێی ووتم چی ڕویداوە. چەند مانگێ بەرلەوە پێشنیاری (هیپنۆتیزم) م بۆکاترین کرد بەڵام ترساو لەم کارە سڵی

کردەوە . بەڵام ئەمجارە بەهۆی دیتنی مۆزەخانەی میسرەوە بەبێ مەیلی چوەژێر بار.

هیپنۆتیزم میکانیزمێکی باشە بۆیارمەتیدانی نەخۆش تائەوڕوداوانەی لەپێشدا فەرامۆشبوون وەبیربهێنێتەوە. لاشەی نەخۆش دەچێتە حەوانەوەو بیر(حافیزە) ی مرۆڤ بەهێز دەبێت. من سەدان نەخۆشم بەهیپنۆتیزم خەواندوەو ئەوەم چنگ کەوتوە کەئەم کارە بەسودە بۆ کەمکردنەوەی نیگەرانی و دڵەخورپەو ، نەمانی ترس، گۆڕینی خوی خراپ و هەروەها یارمەتیدانی یادگارە سەرکوتکراوەکان. هەندێجار سەرکەوتووبووم لەگەڕاندنەوەی نەخۆش بۆ ساڵەکانی سەرەتای منداڵییان. تەنانەت بۆزەمەنێك کە دوو یان سێ ساڵەبوون. لەم ڕێگەیەوە ئەو یادگارییەتاڵ و زەبرەڕۆحیانەی ژیانی ئەویان تێکداوەو لەبیر نەماون بهێنمەوە بیریان. دڵنیابوم هیپنۆتیزم دە ‍ ‍انێ یارمەتی کاترین بدات.

ڕێنومای کاترینم کرد تا بەچاوی نوقاوو پشتیەك کەلەژێر سەریدابوو هەلاژێ. سەرەتا سەرنجی هەناسەدانیم دەدا . بەکردنەوەی دەم ئەو فشارو نیگەرانیانەی کەلەدەرونیا خڕبووبوون قوتاری دەکردن و هەرتاوێك حەوانەوەی قوڵتر دەبوو. پاش چەند خولەك لەسەرنجدان لەهەناسەدانی، پێم وت واهەستبکە ماسولکەکانت دەحەوێنەوە . سەرەتا ماسولکەکانی دەم و چاوو پاشان گەردن و هەردوو شان و بازووەکان و ماسولکەکانی دواوەو ، ئینجا سك و دواجار پێکانی. ئەوهەستی دەکرد لەهەرچرکەیەکدا بەناو قەنەفەکەدا ڕۆدەچێت.

پاشان پێم وت کەڕوناکییەکی سپی و درەوشاوە لەسەر سەرو لەناو لاشەی بێنێتە بەرچاو، پاشان بەهێمنی ئەوڕوناکییەم لەلاشەیدا بەرەو

خوار ڕێنومایی کرد. ئەوڕوناکییە هەموو ماسولکەکانی و ڕۆح و ئەندامانی لاشەی ئارام کردو ناردییە حەوانەوەیەکی قوڵتر. هەرساتێك تێدەپەڕی زیاترو زیاتر هەستی بەهاتنی خەوێکی قوڵ دەکرد. دواجار ئەوڕوناکییە بەڕێنومای من سەرتاپای لاشەی گرتەوەو گەمارۆی دا.

بەپێچەوانەوە لەیەکەوە تا دەم ژمارد . لەگەڵ هەرژمارەیەکدا پتر ئاسودە دەبوو وەدەچووە قولآیی خەواندنەوە. دەیتوانی سەنج بداتە دەنگی من و دەنگ و هەراکانی دی لەبەرچاو نەگرێ. هەمووئەمانە بیست خولەکی خایاند.

پاش ماوەیەك بردمەوە بۆتەمەنی منداڵی تا یادەوەریەکانی ئەوتەمەنەی بیربێتەوە . گەرچی لەخەوێکی قوڵدا بوو بەلآم دەیتوانی قسەبکات و وەلآمی پرسیارەکانی من باتەوە. کاترین ئەزمونێکی تاڵی هاتەوەبیر ئەویش لەشەشساڵیدا لەعیادە ، پزیشکێکدا ڕوویدابوو. هەروەها بەڕوونی ڕووداوی ترسناکی پێنج ساڵەی هاتەوەبیر کەلەسەر تەختەی حەوزەکەوە هەڵیاندابوەناوئاوەکەوە. ئەوکات توشی خنکان بووەو هەندێك ئاوی قووتدابوو. کاتێ لەعیادەکە دەربارەی ئەوڕوداوە دەدوام ، توشی هەمان بارو دۆخبوو. پێم وت کە ئەوشتەڕابردوەو کۆتایی پێهاتووەو ئێستا لەناوئاودا نییە. تاسان وخنکانەکەی تەواوبوو ، هەناسەی گەڕایەوە باری ئاسایی خۆی. هێشتا لە خەواندنێکی قوڵدابوو.

ناخۆشترین و خراپترین ڕوداو لەتەمەنی سێ ساڵیدا ڕویدابوو. بیری کەوتەوە لەژووری نوستنە تاریکەکەیدا بێدارەو ئاگاداری هاتنی باوکیەتی بۆلای. باوکی بۆنی پیسی مەیی لێدێ و کاترین دەیتوانی هەستی پێبکات. ئەو دەستی بۆئەندامی مێینەی بردبوو! کاترین ترساوەو دەستیکردوە

بەگریان و باوکی بەدەستە زبرەکانی دەمی گرت. ئەو نەیدەتوانی هەناسەبدات. لەعیادەکەم لەسەرقەنەفەکەی من و بیست و پێنج ساڵ پاش ئەوڕوداوە کاترین دەستی کرد بەگریان. هەستم کرد کلیلی نهێنی و زانیاری پێویستم چنگ کەوتووە. دڵنیابووم کەپاڵنەری نەخۆشییەکانی ئەو کەم بوون و بەزوویی بەرەو چاك بوون دەچێت. بەهێواشی پێم وت کەئەوەش پەیوەندی بەڕابردووەوە هەیەو ئەو لەژوری نوستنەکەیدانییەو لەحەواندنەوەدایە. هەنسکی گریانەکەی تەواو بوو. وردە وردە هێنامە پێش تاتەمەنی ئێستای .

بەرلەبێدارکردنەوەی پێم ووت کەئەوەی بەمنی وتووە لەبیری بمێنێ پاشان خەبەرم کردەوە. پاشماوەی وەختەکەمان بەگفتوگۆوە دەربارەی ڕووداوی ئەو گورزە ڕۆحیەی باوکی بردەسەر. هەوڵمدا یارمەتییەم تابەم زانیارییە نوێیانە قایل بێت و بە، شێك لەبوونی خۆی بزانێت. ئێستە کاترین هۆکاری پەیوەندی خۆیو باوکی و کاردانەوەکانی ئەو ئەوترسەی لەباوکی هەیبوو دەزانی. وەختێ لەعیادەکەم چوەدەر هێشتا ئەلەرزی بەلاّم دەمزانی ئەوزانیاریانەی دەستمان کەوتبوون ئەرزشی ئەم ترس و لەرزەکاتییەی هەبوو.

لەیادەوەرییەدەردناك و سەرکوتکراوەکانیدا بیرم چوو بەدوی پەیوەندییەکی لێکچونی زەمەنی منداڵی بەوزانیارییەی کەدەربارەی ئاسەوارە دەسکردەکانی میسر هەیبوو بگەڕێم ، بەلاّم خۆهیچ نەبێ ئێستا زیاتر ڕابردوو دەبینێ. ئەو چەندین ڕوداوی ترسناکی ڕابردووی بیرهاتبووەوەو من چاوەڕوان بووم بەزوویی ترس و ناڕەحەتییەکانی کەم بنەوە.

بەلأم بەپێچەوانەوە هەفتەی داهاتوو ووتی کە ترس و بیمەکانی هەروەکو خۆین . سەرسام بووم! نەمدەتوانی تێبگەم کەبەڕاستی چ کێشەیەك لەئارادایە. ئایا دەشیا بەرلەتەمەنی سێ سالیەوە هیچ ڕوبدابێ .
ئێمە چەند هۆکارێکی پێویستمان بۆترسەکانی لەتاسان، لەئاوو لەتاریکی و کەوتنە ناو داوەوە چنگ کەوتبوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ترس و پاڵنەری نەخۆشییەکانی ونیگەرانی و لەدەستدانی کۆنترۆڵی خۆی ساتەکانی بێداری دەشێواند. کابوسەکانی هەروەك پێشو ترسناك بوون. بڕیارمدا زیاتر بیبەمەوە بۆڕابردوو.

کاتی هیپنۆتیزم هێمن و لەسەرخۆو وشەبەوشە دەدوا، لەبەر ئەوە دەمتوانی هەموو قسەکانی بنوسمەوەو ڕاستەوخۆ دەمگواستنەوە سەر کاغەز.( لەوشوێنانەدا کە سێ خاڵم داناوە نیشانەی وەستانە لەقسەکانیدا نەك لابردنی ئەوشتانەی کەدەیوتن. من تەنها شتەدووبارەکانم نەدەنوسی).

هێواش هێواش ئەوم گێڕایەوە بۆ دووساڵی ، شتێکی ئەوتۆی وەبیر نەهات. ڕێك و ڕاست فەرمانم پێدا : ((بچۆبۆزەمەنێك کەنارەحەتییەکانت لەوێوە سەرچاوە دەگرن.)) لەوەی کەبیستم تەواو غافلگیربووم.
« پلیکانەیەکی سپی دەبینم بۆبالأخانەیەك دەچێ، بالأخانەیەکی گەورە و ستوندار، بەری کراوەیە. هیچ دەرگای نییە. من جلێکی گەورەم لەبەردایە... کیسەیەك لەپارچەیەکی زبر دروستکراوە. قژم پەلکە، قژم درێژو ئاڵۆز ».

واقم وڕمابوو! نەمدەزانی چی دەقەومێ و بەکوێ دەگات لێم پرسی ساڵی چەندەو ناوت چییە؟

(( "ئارۆندا". هەژدەساڵانم بازاڕێك لەبەردەم باڵاخانەكەدادەبینم. سەبەتەی زۆری لێیە... دەیدەن بەشانیاندا. ئێمەلە دۆڵێكدا دەژین... بێئاوییە. ساڵی ١٨٦٣ی پێش زاینە. ناوچەكە، وشك و گەرم و بەردەڵانە. چاڵێكی گەورە دەبینم، ڕوبارێ لەم ناوچەدانییە. ئاولەچیاكانەوە دێتە ناو دۆڵەكە)).

پاش ئەوەی جورئیاتێكی زۆرتری دەربارەی ناوچەكە وت پێم ووت چەند ساڵێ لەوزەمەنە بچۆرەپێش و ئەوەی دەیبینی باسی بكە.

((درەختێك و جادەیەكی بەردین هەیە. ئاگرێك ئەبینم شتێك بەسەریەوە دەكوڵێ. قژم خەنەییە. پوزەوانەو جلێكی قاوەیی درێژم لەبەردایە. تەمەنم بیست وپێنج ساڵەكچێكم هەیە ناوی "كلیسترا" یە ... ئەو "راشل"ە. الەحاڵی حازرا راشل برازایەتی و بەینیان زۆر خۆشبوە.) هەوا زۆر گەرمە)).

ڕاچەنیم شتێك لەدڵما گرێی خواردو هەستمكرد زۆرەكە ساردبووەتەوە . یادگاری و باسكردنی وهێنانەبەرچاوی زۆر تایبەتی بوو. نا ئەو دوودڵ نەبوو. ناوەكان، مێژوو بەروارەكان، جلوبەرگەكانو دارو درەختەكان هەموانی بەئاشكرادەبینی. بەڕاست وەخت بوو چی دەقەوما؟ ئاخر چۆن؟ ئەستەم نییە منداڵی ئەو زەمەنەی برازای ئێستەی بێت؟ تادەبوو زیاتر ماتدەبووم . هەزاران نەخۆشی دەرونیم بینیبو، وەزۆرێك لەوانەم خستبوە ژێر هیپنۆتیزمەوە بەڵام هەرگیز ڕوبەڕووی وەها خەیاڵپەردازییەك نەبووبوومەوە. تەنانەت لەخەویشدا شتی وەها ئەستەم بوو. پێم ووت بچۆ بۆكاتی مردنت. دڵنیانەبووم لەگەڵ كەسیكی وا چۆن دەبێ رەفتاربكەم. من بەدوای ڕاستییەكدا بووم كەڕەنگە هۆكاری ترس و

ناڕەحەتییەکانی ئەو بووبێ. حاڵەتەکانی سەرەمەرگ دەتوانن ببنە هۆکاری زەبری ڕۆحی.

وادیاربوو لافاو یان شەپۆلی دەریا لەئانوساتی کاولکردنی گوندەکەدابوو.

**« شەپۆلەگەورەکان درەختەکان ڕیشەکێش دەکەن. پەنا بۆ هیچ شوێنێک نابرێت. هەواساردە . ئاوساردە. پێویستە منداڵەکەم ڕزگاربکەم ، بەڵام ناتوانم ... تەنها دەبێ بەتوندی بیگرم. نوقم دەبم ئاو دەمتاسێنێ. ناتوانم هەناسە بەم، ناتوانم قوتی بەم... ئاوی سوێر. ئاو منداڵەکەم لەدەستم دەفڕێنێ.»** کاترین هەناسەدان بۆی دژواربوو. دەستبەجێ لاشەی ئارام و هەناسەی قوڵ و یەکڕەنگ بووەوە.

**« هەورەکان دەبینم ... منداڵەکەمم لەگەڵە. هەروەها خەڵکی تری گوندەکەشم. براکەم دەبینم».**

کاترین لەحەواندنەوابوو. ئەم ژیانەکۆتایی پێهاتبوو. هێشتا لەخەواندنابوو. من سەرسام بووبووم.. ژیانی پێشوو؟! چونی ڕۆح بۆلاشەیەکیتر؟! ئەوشتانە بەخەیاڵ نەیدەگوتن یان خەیاڵ نەبوون. ئەوانەی لەگێرفانی دەرنەدەهێنا. فیکرەکانی و ئەو وشانەی دەیگوتن هەندێکی نەبێ ئەوانیتر لەگەڵ دۆخی ئاسایی ئەودا جیابوون . هەموو هێڵەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشی دەروونی بەخێرایی بەزەینما تێپەڕی بەڵام باری دەرونی و کەسایەتی ئەو نەیدەتوانی ئەم مەبەستەم لاڕونکاتەوە. شیزۆفرنیا؟! نا ئەو هیچ نیشانەیەکی تێکچونی زەینی و فیکری نەدابوو بەدەستەوە، هەرگیز توشی بیستنی دەنگە وەهمی و خەیاڵییەکان و یاهەرجۆرە تێکچونێکی دەرونی نەبووبوو. وەهەرگیز

دووچاری خەیاڵات و گومان و لەڕاستی دانەبڕا بوو. ئەو چەند مەزاج و هەرسەعاتەو لەسەر بەزمێکی نەبوو، تەنها یەك کاترین هەبوو وەزەینی خۆشی بەتەواوی لەم مەسەلە ئاگاداربوو. هیچ جۆرە ئارەزوویەکی دژە کۆمەڵ و یان لادانی دابوو نەریتی کۆمەڵایەتی نەبوو. هونەرمەند نەبوو! مەوادی بێهۆشکەر یان هیچ مادەیەکیتر کەببێتەهۆی خەیاڵات بەکارنەدەهێناو هیچ نەخۆشیەکی دەروونی و دەماری نەبوو تابتوانیّ ئەم شتە لەکاتی هیپنۆتیزمدا باسبکات. ئەم شتانە یادگاری و یادەوەریەك بوون بەڵام لەکویّ؟ هەستم دەکرد ڕووبەڕوی شتێك بومەتەوە کە زۆرکەم دەربارەیم دەزانی. دووبارەهاتنەوەی بۆژیان و ژیانی پێشوو!

لەدڵی خۆما ئەمگووت نا ئەمە ئەستەمە . زەینی من کەبەشێوەیەکی زانستی گۆشکرابوو لەباوەڕکردن بەو شتە دوورەپەرێزی دەگرد. سەرباری ئەوەش، ئەمە لەبەرچاوی خۆم و ڕێك بەرامبەر چاوەکانم ڕویئەدا. نەمدەتوانی ڕونی بکەمەوەو نەشمدەتوانی ئینکاری لێبکەم.

کۆنترۆڵی خۆمم لەدەستدابوو وەتەواو جەزبیشی بووبووم . ووتم : (بەردەوامبە بزانە هیچی ترت وەبیردیّ؟) چەند بەشێکیتری لەدوو ژیان وەبیرهات.

«اجلیّکی موشەببەکم لەبەرکردووە ، موشەببەکێکیش بەسەرمەوەیە. قژم خۆڵەمێشی و بەشێکیشی ماش و برنجییە. ساڵی ١٧٥٦ی پاش زاینە. ئیسپانیایم. ناوم "لویزا"یە. پەنجاو شەش ساڵم . خەریکم سەمادەکەم. ئەوانی تریش کەلەگەڵمن هەر سەمادەکەن (وەستانێکی زۆر) نەخۆشم، تامە. عارەقێکی ساردم کردوە... خەڵکی

هەموو نەخۆشن ، وەختە بمرن... پزیشکەکان نازانن نەخۆشیەکە بەهۆی ئاوەوەیە » .

دواتر پێی ووتم کەلەو ژیانەیدا لەشفرۆشبوەو لەوشوێنانەدا کە تەریق دەبۆوە ئەمەی پێنەوتبووم. وادیاربوو لەکاتی هیپنۆتیزما دەیتوانی سانسۆری هەندێك لەیادگارییەکانی بکات.

لەوشوێنەدا کەکاترین برازاکەی لەیەکێ لەژیانە زۆر قەدیمەکانیدا ناسیبوو، لێم پرسی ئایا من لەهیچ کام لەوژیانانەیی پێشوویدا هەبووم. دەمویست بزانم ئایا ڕۆلێکم لەو یادگاریانەدا هەیە یان نا. لەچاو بیرکەوتنەوەکانیدا خێرا وەلامی دامەوە .

« تۆمامۆستای منیت. لەسەر بەرزاییەك دانیشتوی . ئێمە فێری خوێندنەوە دەکەیت. پیریت و سەرو ڕیشت ماش و برنجیە. جلێکی سپی ( توگا جل وبەرگی ڕۆمی) ـەحاشیەی ئالتونییەوە لەبەردایە... ناوت-ادیوژن) ە. تۆزۆر ئاقلێ و تێگەیشتویت. بەلام من نافامم. سالی ١٥٦٨ی بەر لەزاینە.» ( ئەم زەمەنە نزیکەی دووانزە سەدە بەرلە سەردەمی ژیانی دیوژن فەیلەسوفی ناوداری یۆنانییە. لەو وەختەشدا ئەم ناوە نامۆنەبووە).

یەکەم ژوانمان کۆتایی پێهاتبوو بەلام دیدارگەلێکیتر لەپێشبوون.

پاش ڕۆیشتنی کاترین لەماوەی چەند ڕۆژێکدا بیرم لێدەکردەوە . ئەمەش ئاسایی بوو بەرەو بیرکردنەوەم بەرێ. دوای هەردانیشتنێکی دەرمانی پزیشکی (ئاسایی) زەینمی بەخۆوە خەریك دەکرد. بەلام ئەمەچی؟ ئەمە دانیشتنێکی ئاسایی نەبوو. سەرباری ئەمانەش زۆر باوەڕم بە ژیانی دوای مردن وچوونی ڕۆح بۆلاشەیەکیترو ئەوشتانەی

پەیوەندی بەوەوە هەیە نەبوو، وەبەردەوام گومانم پێدەبرد. هەرچۆن بێ زەینی لۆژیکیم بیری لێدەکردەوەو پێی دەگوتم کە دەشێ ئەمانە خەیاڵاتی ئەو بن. بەڕاستی نەمدەتوانی هیچ کام لە ئیدیعاو بۆچونەکانی پشتڕاستکەمەوە . لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بەبونی ئەندێشەیەکی داخراو دەکرد لەزەینما. ئەندێشەیەك کەدەیگوت: (زەینت بپارێزە ، زانستی ڕاستەقینە بەبەڵگەو بەکردار دەستپێدەکات. پێدەچێ یادگارییەکانی ئەو خەیاڵات و تەسەوراتی وەهمی نەبن. ئەشێ ئەم مەسەلە جیدی تربێت لەوەی کە بەبیری مرۆڤ دابێت. زەینت بپارێزەو پتر زانیاری دەست بخە.)

شتێکی تریش ئازاری دەدام . ئایا کاترین کەلەسەرەتاوە دووچاری ترس و نیگەرانی بووە قایل دەبێت دووبارە بچێتە ژێر باری هیپنۆتیزم؟ بڕیارم دا تەلەفونی بۆ نەکەم و تا هەفتەی داهاتوو سەبرکەم تائەویش هەزمی ئەوە بکات کەبینیوی.

هەفتەی دواتر کاترین بەدڵخۆشی و شادمانیەوە هاتەوە عیادەکەم بۆهیپنۆتیزم. جێی ئومێد بووچونکە لەچاو جاران ڕەنگ و ڕووی کرابووەوە. بەخۆشحاڵیەوە وتی ترسی هەمیشەی لەنوقم بوون لەناوچووە. ئەوترس و بیمانەشی کەلەتاسان هەیبوو تائاستێکی باش کەم بووبوون. چیدی خەوی وەهای نەدەدی کە لە پلیکانەوە بکەوێتە خوارەوەو پەرێشانی نەدەکرد. سەرباری ئەوەی هەندێ لەجوزئیاتەکانی ژیانی ڕابردووی لەبیربوو بەلاّم هێشتا گرنگی عیادەکەمی بۆدەرنەکەوتبوو.

چەمکەکانی ژیانی پێشوو چوونی دووبارەی ڕۆحی مرۆڤ بۆلاشەیەکی تر لەلای ئەو نامۆبوون. کەچی یادگارییەکانی هێندە ڕوون و ئاشکرابوون کە دەتگووت ئەولەوێ بووە. هێندە بەهێزو بەبەڵگەبوون کە بەڕاست دەشێ لەوێ بوبێ! خۆی بچوکترین گومانی لەبارەوە نەبوو بەلاّم نەشیدەزانی ئەم شتانە چۆن چۆنی لەگەڵ بیرو باوەڕو ئاراستەی پەروەردەکردنیا یەکدەگرنەوە؟!.

ئەوهەفتەیە کتێبێك دەربارەی پەیڕەوکردنی ئاینەکان کەلەزانکۆ لەکۆلۆمبیا خوێندبومەوە دووبارە خوێندمەوە. لەئینجیلی قەدیم و نوێشدا ئاماژەیەك بە هاتنەوەی دووبارەی ڕۆح کرابوو. ساڵی ٣٢٥ی ز. (کۆنستاتین) ی ئیمپراتۆری گەورەی ڕۆم و دایکی (هیلین) ئەو ئاماژانەی

لە بارەی گەرانەوەی ڕۆحەوە لەئینجیلی نویٚ داهەبوو لایان بردبوو. شورای دووەمی قوستەنتینیە کەلەساڵی ٥٥٣ز. کۆبونەوەو پێداگری لەسەر ئەم کارە کردوو وەرایگەیاند کەئەم بابەتە کوفرو لەرێ لادانە. وایاندەزانی گەشەی کلێسا ڕوەو لاوازیەو ئەم چەمکە زەمەنێکی زۆر بۆدەرباز بوون لەدەستی مرۆڤ دادەنێ. هەرچۆنێك بێ ئامازە بەو باسەدرابوو وەپیاوانی یەکەمی کلێسا بڕوایان پێیی هەبوو. عاریفەکانی یەکەم (کلیمێنیت ئەسکەندەریە) و (ئۆرجین) و ( جیرۆمی پیرۆز) و زۆری تریش بڕوایان وابوو کەپێشتر لەدایك بوون و دووبارەش لەدایك دەبنەوە.

بەلاّم من هەرگیز بڕوام بەشتی وانەبووە. لەژیانما بیرم لێنەکردبۆوە هەرچەند زانیاری مەزهەبەکەم ئامازەیەکی نادیارو داخراوی بەبونی ڕۆح دوای مردن دەکرد، بەلاّم بڕوام پێیان نەهێنابوو.

لەکۆی چوار منالّی لەوەدا گەورەترینیان بووم. هەریەك سیٚ سالّ تەمەن مەوداممان بوو. لەشارۆچکەیەکی نزیکی (نیورجسی) دەژیاین. من منالێکی چاکسازو گەورەی خێزان بووم. باوکم زیاتر لەهەمووان دەرگیری مەزهەب بوو.

ئاین و مەزهەبی وەکو ژیان بەجیدی دەگرت. تەواو کردن و سەرکەوتنی خوێندنی منالّەکانی گەورەترین چێژی ژیانی بوو. لەئاژاوەو گێرەشێوێنییەکان لەمالّەوە تاوی دەسەندو کەناری دەگرت. هەلّسوکەوتکردنی باوکم منی بەرەو بیرکردنەوە بەکێش دەکردو ئەمەش وایکرد ئامادەبم بۆ بوون پزیشکی دەروونی. ئێستە کەلەڕابردوو دەڕوانم دەبینم منداڵیم ئاسودەترو بەرپرسیاری کەمتر بوو. دواجار مرۆڤێکی

جیدی وەبارهاتم، دروست وەك كەسێ كەپتر لەئاستی توانای خۆی خوی
بەبەرپرسیاریوە گرتبێ كاتێك كەبەوەرگرتنی پۆستێك قایل دەبێ.

دایكم هەمیشە دەربڕی ئەوینی خۆی بوو، وەهیچ بەربەستێ ئەوی لەم كارە ڕانەدەگرت. ئەو كەسێكی سادەتربوو لەباوكم. زۆربەكەمی غەمگین دەبوو ئێمەش ئەمەمان بەپاڵپشتی و ئەوینی دایكمان دەزانی.

باوكم وەكو كاری وێنەگری ئیشێكی باشی هەبوو.. ئەمەش وا یدەكرد خۆراكمان زۆرو جۆراو جۆر بێ بەلاَم پارەو داهاتێكی كەممان لەبەردەستابوو. وەختێ برابچوكەكەم لەدایكبوو من نۆ ساڵان بووم. ناچاربوین ئاپارتمانێكی بچوك كەدووهۆبەی نوستنی هەبوو لەنێوان شەش سەر خێزان دابەشبكەین.

ژیان لەم ئاپارتمانەبچوكەدا بێ حەوانەوەو پڕلەبگرەو بەردەبوو. لەگەڕانم بەدوا ئارامییەكدا پەنام بۆكتێبەكانم دەبرد. یارییەكانی ب[illegible]و تۆپی دەست لەویاریانەبوون كەلەمنداڵیدا خولیایانبووم بەلاَم یاریم نەدەكرد. بێووچان دەمخوێندەوە. ئەوەم دەزانی كەخوێندن تەنهاڕێگەمە بۆدەربازبونم لەوشارەبچوكەو پاشانیش ئاسودەبونمە بۆیەهەمیشە لەپۆلدا یەكەم یان دووەمی پۆل بووم.

وەختێ بورسی كاملّی خوێندنم لەزانكۆی كۆلۆمبیا وەچنگكەوت، لاوێكی پڕكارو چالاك بووم . بڕینی قۆناغی زانكۆ لەلام دژوار نەبوو، كۆلێژەكەی خۆم كیمیا بوو بەپلەی زۆرباش تەواوم كرد. بڕیارمدا ببمە پزیشكی دەروونی . چونكە زۆر حەزم لەم بوارە دەكردو كاركردنیش لەسەر مێشكی مرۆڤ ڕازی دەكردم. سەرباری ئەمانە پسپۆری لەپزیشكیدا ئەوەی پێدەبەخشیم تادڵسۆزیم بۆمرۆڤەكان دەربرِم. لەپشووی

هاوینەکەیدا لەئوتێلێك لەچیاکانی (کاتزکیلّ) وەکو شاگرد کارم دەکرد. ڕۆژێك (کارول) میوان بوو. یەکمان ناسی. کتوپڕ هەردوو جەزبی یەکتربوین و پێکەوە هەستمان بەئاسودەیی و ئاشنایەتی کرد. نامەمان بۆیەکتردەنارد . وادەی سەردان و ژوانمان دادەنا .. عاشق بوین و وەختێ لەساڵی سێیەمی زانکۆی کۆلۆمبیا بووم بوینە دەسگیرانی یەك. کارول زیرەك و جوان بوو. لاوەکان وەختێ شتەکان بەپێی نیازی دڵیانە ئیدی بۆژیان و مردن و پاش ئەویش هیچ خەمێکیان نییە. وەختبوو دەبوومەزاناو فێردەبووم کەبەشێوازێکی لۆژیکی و بەبێ ئیحساسات و بە(سەلماندنی مەسەلەکان) بیربکەمەوە.

کۆلێژی پزیشکی و پابەند بوونم لەزانکۆی یلّ (Yale) زیاتر ئەم ڕەوتەزانستیانەیان لادامەزراو کردم. توێژینەوەکەی من لەسەر کیمیای مێشك و ڕۆڵی گوێزەرەوەکانی دەمار کەپەیام نێرەکانی کیمیایی شانە لەمێشکدا نوسرا.

من پەیوەستی نەوەی نوێی دەروونی بایۆلۆژیم ، ئەوانەی گریمانەکان و ڕەوشەکانی باوی( دەرونی)یان لەگەڵ زانستی نوێی کیمیای مێشك تێهەڵکێشکردووە. وتاری زانستی زۆرم نوسیووە، لەکۆنفرانسە ناوخۆیی و نێودەوڵەتیەکاندا بەشداریم بەوتاردان کردوەو لەپسپۆڕی خۆمدا قەوارەیەکم هەبووە. تاسنوری وەسواسی بوون جیدیو دوور لەعەتف بووم ئەمانەش بۆپزیشکێك تایبەتمەندی باشن. وام هەستدەکرد هەرکەس بێتەلام بۆچارەسەر لەدەستم دەر ناچێت.

پاشان کاترین ببووە (ئاروندا) کچێکی لاو کەلە ١٨٦٣بەر لەزاین ژیابوو، ئێستاش خۆشحاڵتر لەچاو پێشتر لێرە بوو.

دیسان خەمم بوو نەوەك كاترین لەبەردەوامی كارەكەمان بترسیٚ و ملنەدا بەڵام بەتامەزرۆییەوە ئامادەی هیپنۆتیزم بوو وە بەزوویی چووە خەو.

«من خەریكم چەپكە گوڵ ئەدەم بەدەم ئاوەوە. ئەمە كارێكی پیرۆزە. قژەكانم خەنەیی و پەلككراون. جل و بەرگی قاوەیی‌و ئاڵتونیم لەبەردایەو سەندەڵ لەپێم. كەسێ مردووە، یەكێ لەخانەوادەیەكی دەسترۆیشتوو... دایكێك. من خزمەتكاری خێزانێكی بەدەسەلاتم و فەرمانم یارمەتی دانە لەئامادەكردنی خۆراكدا. لاشەی مردووەكان سێ رۆژلەناو خوێیاو دادەنێن تا وشك ببن و پاشان پارچەكانی دەردێنن. هەست بەبۆنیاندەكەم. بۆنی لاشەكان.»

بەخێرایی گەڕابوەوە بۆبەشێكی دی لەقۆناغی ژیانی (ئاروندا) ، بۆئەووەختە ، كەفەرمانی ئامادەكردنی لاشەكان بوو دوای مردنیان

كاترین بەردەوام بوو: «ئەتوانم لاشەكان لەبالاخانەیەكی تردا ببینم . ئێمە خەریكین دەیانپێچینەوە.كەسی مردوو مولكەكانی لەگەڵ خۆی دەبا تابۆژیانی دواترو گرنگتری ئامادەبێ.» كاترین چەمكی مەرگ و ژیانی دوای مردن كەبەپێی توێژینەوەكان بیرو باوەڕێكی میسریەو لەهەموو لایەكەوە بەبیرو باوەڕی ئێمەی نەدەخوارد دەگێڕایەوە. لەو مەزهەبەدا كەسی مردوو شتەكانیان لەگەڵ دەنارد.

كاترین ئەو قۆناغەی ژیانی تەواو كردوو پشوی دەدا. لەپێش چوونە ناو قۆناغێكی بەڕواڵەت كۆن چەن خولەكێك هەڵوێستەیەكی كرد.

« دەبینم ئەشكەوتەكە چلورەی كردووەو شۆڕبونەتەوە... تاوێر...»

بەسەرسوڕمانەوە باسی ئەوشوێنە تاریك و نەگبەتارییەی دەكردو

نارەحەت بوو. پاشان چۆن خۆی دیتبوو وەها باسی کرد. « من ناشیرینم ، پیس و بۆگەنم.» چووە زەمەنێکی دی.

« هەندێ بالأخانە دەبینم، ئەسپ و عەرەبانەیە تایەکەی بەردینە لێرەیە. قژم قاوەییەو پارچەیەك بەسەرمەوەیە. ناو ئەسپ و عەرەبانەکەکای تیایە. من دڵخۆشم. باوکمی لێیە. لەباوەشی کردووم. ئەو... "ئیدوارد"ە (پسپۆڕی منالأن کەپێداگری کردبوو کاترین بێت بۆلام.) ئەو باوکمە. ئێمە لەدۆڵێکی پڕلەدارو درەختادەژین. لەحەوشەکەماندا دار هەنجیرو زەیتون هەیە. خەڵکی لەسەرکاغەز دەنوسن . شتی سەیرو سەمەرە، وەکو وشە لەسەر کاغەزەکانە. خەڵکی بەدرێژایی ڕۆژ دەنوسن، کتێبخانە بونیات دەنێن. ساڵی ١٣٥٦ ی پێش زاینە. زەوییەکان نەچێنراون. باوکم ناوی "پرسیڤنس" ە .»

ساڵەکەی بە- ‌اوی ڕێك نەبوو، بەڵام دڵنیابووم هەمان قۆناغ بوو کەهەفتەی پێشترلێی دوابوو. بەرەو پێشترم برد.

« باوکم تۆدەناسێ. (مەبەستی من بوو) پێکەوە دەربارەی وەبەرهێنان و یاساو دەوڵەت دەدوێن. باوکم دەڵێ تۆ زۆرزیرەکی و من دەبێ گوێڕایەڵی تۆبم. » بردم بەرەو پێشتر. « ئەو(باوکی) لەژوورێکی تاریکدا ڕاکشاوە. پیرو نەخۆشە. هەوا ساردە... هەست بەخاڵی بوون ئەکەم .» چووە زەمەنی مردنی. « هەنوکە پیرو پەککەوتەم . کچەکەم لەوێ نزیك جێگاکەمە. مێردەکەم مردووە. مێردی کچەکەم و منالەکانی لەوێن ».

ئەمجارە مەرگی بەئارامییەوە بوو. ئەو بە هەلأژاوی مابووەوە. ئەم مەسەلە منی خستەوە بیری لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر (ریموند مودی)

لەبارەی ئەزموونەکانی سەرەمەرگ. ئەوکەسانەی لێکۆڵینەوەی لەسەرکردبوون لەبیریانە کەسەرەتا هەڵآژاوبوون و پاشان بەئاراستەی لاشەکانیان بەکێشکراون. چەندساڵێك لەمەوبەر کتێبەکەیم خوێندبووەوە بەزەینماهات دووبارە بیخوێنمەوە. ئەمویست بزانم ئایا کاترین هیچ شتێکی دوای مردنی بەبیردێ. تەنها ووتی «من هەڵآژاووم.» خەبەرم کردەوەو کۆتاییم بەودانیشتنە هێنا.

لەکتێبخانە پزیشکیەکاندا بەخولیایەکی زۆرەوە بەدوای ئەو ووتارانەدا گەڕام کەدەربارەی چوونی ڕۆح بۆلاشەیەکیتر بلأوکرابوونەوە. کارەکانی دکتۆر (ئیان ستیڤنستون) مامۆستای دەرونی لەزانکۆی ڤیرجینیا کە کتێبی زۆری دەربارەی نوسیووە خوێندەوە. دکتۆر ستیڤنسون زیاتر لە دووهەزار نموونەی پەیوەندی دار بەومنالأنەی کە یادەوەری و ئەزموونی گەڕانەر ی ڕۆحیان بووە وەکو نمونە کۆکردوەتەوە. گوزارش کانی ئەو موعجیزەئاسان و بەووردی تاوتو یێ کراوەو ووردوو کامڵن.

توێژینەوەکانی دکتۆر (ئەدگار میشلی)م خوێندەوە. زانیاری زۆری دەربارەی هەستی شەشەم لەزانکۆی (دیڤك) تێدابوو، هەروەها نوسینەکانی پرۆفیسۆر (سی جی دوکاس) لەزانکۆی براون بەخولیایەکی زۆرەوە موتالأمکرد. توێژینەوەکانی دکتۆر(مارتینئیبڤن) ، دکتۆر (گرترڤید شمیلدر) و ، دکتۆر (فریدریك لنز) و دکتۆر (ئەدیەت فریوەر)م بەووردی شیکار کرد. هەرچی زیاتر دەمخوێندەوە مەیلم بۆموتالأی ئەم باسانە زیاتر دەبوو. لەگەڵ ئەوەی خۆمم لەبارەی ڕەهەندەکانی زیهنی مرۆڤ خوێنەوارترو پڕزانیاری دەزانی هەستم کرد زانیاری و زانستم کەم بووە. سەرباری ئەوەی کتێبخانەکان پڕن لەم توێژینەوەو بەڵگەنامانە

کەمتر کەسێك شتێ دەربارەیان ئەزانێ. زۆرێك لەو توێژینەوانە زانایان و پزیشکانی بەناوبانگ ئەنجامیان داون و هەمووان دووبارەو پێداگریشیان لەسەرکردوەتەوە. ئایادەشیا هەموو ئەمانە بەهەڵەداچووبن؟ بەڵگەو شاهیدەکان پتەو و پشتڕاستکراوبوون کەچی هێشتا هەرگومانم هەبوو. بەهەرحاڵ لەگەڵ هەبوونی بەڵگە باوەڕکردن بەوشتانە لەلام دژواربوو.

منیش و کاترینیش هەرکام بەچەشنێ و بەتوندی کەوتبوینە ژێرکاریگەری ئەم ئەزموونەوە. تەندروستی کاترین چاکتردەبوو ، منیش تێڕوانینم گشگیرتر دەکرد. ترس و بیم ساڵانێکی زۆر ئازاری کاترینی دابوو وە هەنووکە لەشەڕی ئەوانە قوتاری بووبوو. هەرچۆنبێ لەڕێی یادگاری یاخود خورافیاتەوە ڕێگایەکم بۆ یارمەتیدانی کاترین دیتبووەوەو بەنیازی ڕاگرتنی نەبووم.

لەسەرەتێ   دانیشتنی دواتر، وەختێ چووە خەواندنەوە بۆساتێ   م لەهەموو ئەمانە کردەوە. بەرلەوەی، بیخەوێنم باسی خەوێکی کرد دەربارەی چەشنە یارییەکی سەر تەختەی شەترەنج کە کونکون بووەو لەسەر پلیکانە بەردینەکۆنەکان ئەنجام درابوو. ئەم خەوە بەلایەوە نامۆو بەپێچەوانەشەوە زۆر ڕوون بوو. لەکاتی هیپنۆتیزما پێموت کەلە سنورە سروشتییەکانی زەمەن و شوێن تێپەڕێ و بچێتە ناو ژیانە کۆنەکان و بنەچەکانی ئەم خەوە لەوێدا بدۆزێتەوە.

پرسیاری ناوی ئەوشوێنەی کەتیادەژیا لێمکرد و وتم ئایا ئەتوانێ مێژووەکەی ببینی یان ببیسی؟

«پلیکانێ ئەبینم بۆبورجێك ئەچێت... بەرزترلەشاخ و دەریاشە. من کورم و مووم خەنەییە... مووی سەیر. جلەکانم کورتن . قاوەیی و

سىن، لەپێستی ئاژەڵ درووستکراوە. چەندپیاوێ بەسەر بورجەکەومن لەوان چاودێرن... پاسەوانن. ئەوانە ناپاکن. چەشنە یارییەک ئەکەن وەکو "دامە"یە. بەڵام نا ئەو تەختەکەی خڕە چوارگۆشەنییە... بەپولی نیژ کەوەک خەنجەر دەچێ بەکێلانەکەیدا ئاوەها جێگە دەگرێ یاری لەکەن. سەر پولەکان شێوەی وەکو سەری ئاژەڵانە. خاکی"کروستان"لەهۆڵەند. ساڵ نزیکەی ١٤٧٣یە.

ئێستە لەبەندەرێکدام. دەریا وەختە ووشک ئەکات. تەپۆڵکەیە هەیە... ئاویش. خانۆچکەیەک ئەبینم ... دایکم لەمەنجەڵێکدا چێشت لێئەنێ. ناوم "یۆهان"ە!!

بردمە زەمەنی مردنی. لەم دانیشتنەدا بەدوای سەرەداوێکا وێڵبووم کەبتوانێ هۆکاری ناڕەحەتییەکانی ژیانی ئێستایم بۆڕوونکاتەوە. تەنانەت ئەگ خەیاڵ و خورافیاتبن کەدڵنیاش نەبووم وابن لەهەر ب کدا ئەیتوانی پاڵنەری نەخۆشییەکانی بێت. خەڵکی زۆرم بینیبوو خەوبینین ببووە هۆی زەبری ڕۆحییان. هەندێ کەس ناتوانن بیریان بێتەوە کەزەبرێکی ڕۆحی پەیوەندی بەمنداڵیەوە هەیە یان لەخەودا بینیویانە یان لەڕاستیدا بەسەریان هاتووە. هەرچۆن بێ یادگاری ئەوزەبرە ڕۆحییە لەگەورەیشدا هەر سەرگەردانیان ئەکات.

ئەوەی تائەو ڕۆژە تاوتوێم نەکردبوو زەبرە یەکلەدوای یەکەکانە کەهەرڕۆژەو شوێنەواری لەناوبەر بەجێدێڵێ، لەوانە لۆمەو سەرزەنشتەجاڕس کەرەکانی دایك و باوکە کەدەتوانێ ببێتە هۆی زەبری دەرونی تەنانەت بەهێزتر لەهەر ڕوداوێکی شڵەژێنەری ڕۆحی. ئتر ئەم شوێنەوارە تێکدەرانە تێکەڵ بەژیانی ڕۆژانە دەبن و بیرهاتنەوەی ئەوانە

دڕوارتر ئەکەن. پێدەچێ منداڵێك کەڕۆژانە ڕووبەڕووی سەرزەنشت ئەبێتەوە هێندەی منداڵێك کەلەبیریەتی لەڕۆژێکدا بەکەم سەیرکرابێ متمانەو ڕێزی خۆی لەدەسبات. منداڵێ کەخێزانەکەی توشی هەژاری بوون و هەمووڕۆژێ لەبێخۆراکیدا ڕەنج ئەبات ڕەنگە دواجار دووچاری هەمان کێشەی دەروونی ئەو منداڵەبێتەوە کەلەزەمەنێکی تایبەتدا بەڕێکەوت توشی برسیەتیەکی زۆری تائەندازەی مەرگ بووبێ. زوو پەییم بەمەبرد کە پێویستە بەهێزە دوورخراونەبووەکانی ڕۆژانەی ژیانیش هێندەی ڕوداوێکی شڵەژێنەرو کشتگیر گرنگی بەین.

کاترین هاتەوە دووان.

((کەشتییەکان وەکو کەشتی پێشبڕکێ وان و ڕەنگیان ڕوونە. ویلایەتی"پراڤیدنس"ە. چەکو تفاقمان پێیە. نێزە، بەردە تەقانێ، تیرو کەوان ...م گەورەتر. تەختەی سەوڵ لێدانی گەورە لەناو کەشتیەکەدایە... هەمووان دەبێ سەوڵ لێدەن. پێئەچێ وونبین، تاریکە. هیچ تروسکاییەك نییە. ئەترسم. کەشتییەکانی دی لەگەڵماندان"بەڕواڵەت گروپێکی هێرش بەر" لە گیانلەبەران ئەترسم. ئێمە لەسەر پێستی گەندو پیسی ئاژەڵان ئەنووین. پاسەوانی ئەکەین. پێڵاوەکانم جۆرێکی سەیرن وەکو کیسە...لەسەر قۆزەك گرێدراوون... لەپێستی ئاژەڵە."وەستانێکی زۆر" دەموچاووم لەئاگراگەرمبووە. پیاوانی ئێمە خەریکی کوشت و بڕن بەڵام من شتی واناکەم. من نامەوێ کەس بکوژم. چەقۆم لەدەستایە)).

لەپڕا دەستی کرد بەهەناسە هەنکێشان و لەگەرویەوە لرخەلرخ دەهات.

ووتی که یەکێ لە دووژمنان لەدواوە گەردنی گرتووەو گەروی بڕیووە. ..رلەوەی بمرێ دەمووچاوی بکوژەکەی خۆی بینیبوو. ئەو ئیشتوارت بوو بەلام لەوزەمەنا شکلێکی تری هەبوو. کاترین ئەیزانی کە ئیشتوارت بووە. بۆهان لەتەمەنی ٢١ساڵیدا کۆچی دوایی کردبوو.

پاشان خۆی بینیبوو بەسەرلاشەیەوەو سەیری دیمەنی خوارەوەی ئەکرد ئیتر دۆش دامابوو وەبەرەو هەورەکان بەرز دەبۆوە. بەخێرایی هەستی کرد بەکێشدەکرێ بۆناو فەزایەکی گەرم و بچوک . لەبەردەم لەدایکبوونێکی نوێدابوو.

لەژێر لێوەوەو بەخەواڵویی ووتی: « کەسێ گرتوومی. کەسێک کەلە لەدایک بوونما یارمەتی دام. ئەو جلێکی سەوزو پێشبەندێکی سپی پۆشیوە. کلاوێکی سپی لەسەرە گۆشەکانی بەرەو دوواوە گلاون. ..ەکە پەنجەرەی سەیرسەیری تێدایە...بەشێکی ..ری بالاخانەکە بەردینە. دایکم قژی د.ێژوو ڕەشە. ئەو ئەیەوێ بمگرێ لەباوەش. دایکم... جلی نوستن و زبری لەبەرە. جلی نوستن و زبر لەگەڵ بەرم ئەکەوێ ئازارم ئەدات. چەند خۆش و چاکە لەبەر هەتاوبوون و گەرم بوون...ئەو... هەرئەو دایکەیە کەئێستەهەمە!»

بەدرێژایی دانیشتنی پێشوو داوام لێکردبوو بەووردی تەماشای مرۆڤە گرنگ و بەنرخەکانی قۆناغەکانی ژیانی بکات و ئایا ئەتوانێت ئەوان وەکو کەسەگرنگ و بەنرخەکانی ژیانی ئێستای(کاترین) بناسێ. زۆربەی نوسەران بڕوایانوایە گروپەکانی ڕۆحەکان پێیانخۆشە چەند جارێك پێکەوە بچنەوە ناو لاشەکان و کارمایەکانی خۆیان( ئەوقەرزانەی لای خۆیان و

خەڵکییەو ئەو وانانەی پێویستە فێری ببن) لەقۆناغە جیاجیاکانی ژیانیاندا بدەنەوە.

ئەمویست ڕاستی و دروستی ئەم مەسەلە یەکلابکەمەوە. لەبەرئەوە دوورلەدەست و لەعیادە نیوە تارەکەمدا لەپێناو دەرککردنی ئەم شانۆگەرییە دیدەنییە کە سەمەرەکانی پەردەبەپەردە دەرئەکەوتن لەسەرکارەکەم بەردەوام بووم. ئەبوو لەپێناو تاووتوێ کردنی ئەم باسە زۆر نائاساییە کەلەزاری کاترین ئەهاتنەدەر کەڵکم لەو ڕەوتەزانستییانە وەرگرتایە کەلە ماوەی پانزەساڵی ڕابردوودا فێربووبووم و بەکارم هێنابوون.

لەمەودای نێوان هەر دانیشتنێکدا هەستم ئەکرد توانای ڕۆحی کاترین زۆر بەهێز بوون. دەربارەی هەندێ کەس و ڕوداو ئیلهاماتی وای هەبوو کەدواتر ڕاستی و درووستی ئەوانە یەکلائەبووەوە. ٭درێژایی دانیشتنەکانی هیپنۆتیزم، بەرلەوەی من پرسیاربکەم ئەو لەوەلامدانەوەیدا پێشدەستی ئەکرد. زۆرێك لەڕوئیاکانی حاڵەتی پێشگویی و ئیلهامیان هەبوو.

جارێك باوك و دایکی بۆ دیتنی هاتبوون، باوکی لەوەی لەکاترینی ئەبینی دوودڵ بوو. کاترین لەبەر پشتڕاسکردنەوەی ڕاستییەکان باوکی برد بۆ مەیدانی پێشبڕکێی ئەسپسواری . لەوێ و لەبەردەم باوکیدا ئەسپە پێشکەوتووەکانی گشت پێشبڕکێکانی دیاری کرد. باوکی واقی وڕمابوو. پاشان کاترین هەموو ئەو پارانەی کە بردبویەوە لەدەرەوەی مەیدانی ئەسپسواری دابوو بەهەژارێك. چوونکە ڕای وابوو نابێت تواناڕۆحییەکانی خۆت لەپێناو ماددەدا بەکاربێنی. بەلای ئەوەوە ئەم توانایانە ئەرزشی

زیاتره لەبەهای ماددی. پێی دەووتم تا ئەندازەیەك ئەم ئەزموونە بەلامەوە ترسناك بووە ، بەڵام هێندە لەتواناو هێزی پێشکەوتەی خۆی ڕازی بوو کە پێی خۆش بوو دووبارە ئەزموونی هیپنۆتیزم بکات. من لەکاتێکدا سست و بێحاڵ بووبووم جەزبی تواناکانی ئەویش بووبووم. بەتایبەت ئەوەی مەیدانی ئەسپسوارییەکە کەبەڵگەیەك بوو شایانی دان پیانان. ئەو بلیتی بردنەوەی هەموو پێشبڕکێکانی دیاری کردبوو. ئەم کارە بەڕێکەوت ناکرێ. لەچەند هەفتەی دواتردا کۆمەڵێك شتی زۆر سەیرو نامۆ لەساتی ڕووداندا بوون و من تەنها هەوڵم ئەوەبوو دیدی خۆم بپارێزم. نەمئەتوانی نکوڵی توانا ڕۆحییەکانی ئەو بکەم. باشە ئەگەر ئەم توانایانە ڕاستی بوون و ئەیانتوانی بەڵگەی حاشاهەڵنەگر نیشانبەن ئەی گووتەکانی دەربارەی ژیانە پێشووەکانی دەشیا ڕاستبن؟

هەنوکە گەڕایەوە بۆ قۆناغێك کەچەند ساتێ ،ەبەر تیایدا لەدایك بووبوو. وادیاربوو ئەم گەڕانەوەی بۆلاشە لەقۆناغێکی نوێتردابێت بەڵام نەیئەتوانی ساڵەکەی دیاری بکات. ناوی (ئیلزابێت) بوو.

((ئێستا گەورەترم. برایەك و دوو خوشکم هەیە . سفرەی نان خواردنی شێو ئەبینم... باوکم لەوێیە... ئەو "ئیدواردە."ئیدوارد پزیشکی منالان بۆنمایشێکی تر وەکو باوکی هاتبۆوە دونیا" باوکم و دایکم دیسان ئاژاوەو دەمەبۆڵەیانە. خواردنەکە پەتاتەو لۆبیایە . باوکم تورەیە چونکە خواردنەکە ساردە. ئەوان زۆر شەڕئەکەن . ئەو بەردەوام مەی دەنۆشێ ... لەدایکم دەدا. "نیشانەی ترس لەدەنگیا بوو دەلەرزی" ئەو پاڵ بەمناڵەکانەوەدەنێ. وەك جاران نییە زۆرگۆڕاوە. من خۆشم ناوێ . بریا ئەڕۆی.)) کاترین وەك مندالێ دەدوا.

چۆنییەتی پرسیاركردنەكانی من لەم دانیشتنانەدا لەگەڵ ئەوڕەوشەی بۆ چارەسەری نەخۆشی دەرونی ئاسایی بەكارم دەهێنا تەواو جیاوازبوو. من لەگەڵ كاترین زیاتر وەكو ڕێنومایی دەرێ كارم ئەكردو هەوڵم ئەدا لەماوەی یەك دوو كاژێردا هەموو قۆناغەكانی ژیانێك بەسەركەینەوە . ئێمە وەدوی ڕوداو و ڕاستیەكدا وێڵ بووین كە ڕەنگبێ بتوانن دەربڕی بارو دۆخی هەنوكەیی ئەوبن. ئەم دەرمانە ئاساییە بەخێراییەكی كەمترو جوزئیاتێكی زیاتر ئەنجام ئەدرا. هەر وشەیەك كەدەربارەی نەخۆشی نەخۆش ئەوترێ لەپێناو چەمكە جۆراو جۆرەكانیدا دەخرێتە ژێر باس و لێكۆڵینەوە. هەر حاڵەتێكی دەم و چاو، هەرجوڵەیەكی لاشەو هەركەم و زیادبوونێكی دەنگی نەخۆش تاوتوێ دەكرێ. هەرپەرچەكردارێكی ئیحساسی دەبێتەجێی توێژینەوەی ووردو درشت و نمونەی ڕەفتارەكانی دە بنەپاڵ یەكدی و پێوەند دەكرێن. بەڵام دەربارەی [illegible] ین ساڵەكان بەخێرایی یەك خولەك تێئەبەڕین. هیپنۆتیزمەكانی كاترین وەك شۆفێری كرنێكی زۆرخێرابوو... وەلەم خێراییە زۆرەدا دەموچاوێك لەناو كۆمەڵێكدا دەسنیشانبكەین.

داڵغەم هێنایەوە لای كاترین و داوام لێكرد زەمەن تێپەڕێنێت.

« شووم كردووە. خانوەكەمان ژورێكی گەورەی تێدایە. مێردەكەم قژی بۆرە. ئەو ناناسم. "واتە لەژیانی ئێستایدا نەیدیوە" هێشتا منالمان نییە... ئەو زۆر لەگەڵم باشە. ئێمە یەكترمان خۆشدەوێ و خۆشحاڵین.»

وادیاربوو لەدەست زۆرو ستەمی باوكی قوتاربووبوو. داوام لێكرد باسی ئەو ناوچەیەبكات كەتیادەژی .

کاترین بەگومانەوە وتی:«"بیرنگتۆن". کتێبی جەڵد سپی و سەیر و لۆن ئەبینم. کتێبێکی گەورە بەند دەکەن. ئینجیلە. ووشەکانی گەورەو "نزینی"ن... وە زمانی "گیل"* ».

لەم کاتەدا هەندێ قسەی کرد نەمتوانی لێیان تێبگەم. نازانم بەزمانی گیلێ ی بوو یان نا.

« ئێمە لەووشکانیدا ئەژین، لە ئاوەوە نزیك نین. ویلایەتی... برینگتۆن؟ کێڵگەیە دەبینم بەرازو مەڕی هەیە. ئەم کێڵگەیە هی ئێمەیە.» لەو زەمەنە چووە پێشتر.

« ئێمە دووکوڕمان هەیە. کوڕەگەورەکەم وەختی ژنیەتی. بورجی کڵێسا ئەبینم... بالاخانەیەکی بەردینی زۆرکۆن.» کت و پڕ سەری گورزی بەرکەوت. هەستی بەئازار دەکرد تەوێڵی چەپی بەدەست گرتبوو. وتی کە لەسەر پلیکانە بەردینەکانەوە کەوتو بەڵام باش بوو. ئەو لەکاتێکدا کەئەندامانی خێزان لەدەوری بوون بەهۆی پیرییەوە لەجێگاکەیدا مرد.

لەپاش مردنی دووبارە لەلاشەی دەرچوو بەڵام ئەمجارە گێژوو سەرگەردان نەبوو.

« ڕوناکییەکی درەخشان ئەبینم. ناوازەیە. ئەم ڕوناکییە هێز بەمرۆڤ ئەبەخشێت.» لەدۆخی پشوودانی پاش مردن و لە بەرزەخابوو. چەند ساتێ بەبێ دەنگی تێپەڕی. لەپڕا هاتەدووان بەڵام بەو نەجوایەی کەهەمیشە پێی دەدوا. ئێستە دەنگی بەبێ دوودڵی و تورەیی و گەورەبوو.

(( کاری ئێمە فێربوونە. کارمان ئەوەیە لەڕێی زانست و زانینەوە ببینە بونەوەرێکی خودایی. پاشان لەخودا نزیك ئەبینەوەو ئیتر دەتوانین پشووبەین. دواتریش ئەگەڕێینەوە تایارمەتی خەڵکانی تربەین و فێریانکەین)).

من مات و گێژ بووبووم ، لێرەدا باس لەدوای مردن کرا. باس لەبەرزەخ. سەرچاوەی ئەم زانیاریانە چی بوو؟ ئەم دەنگە وەکو دەنگی کاترین نەبوو. هەرگیز ئەم ووشەو دەربڕینانەی بەکارنەدەهێنا . تەنانەت ئاوازی دەنگیشی جیاواز بوو.

لەوکاتەدا دیاریم نەکردبوو کە ئەگەر چی کاترین ئەم شتانەی گوتبوو بەلاّم سەرچاوەکەی بیرو باوەڕنەبوون بەڵکوئەوەی بەو دەوترا دووبارەی دەکردەوە. دواتر وتی کە ڕۆحەمەزنەکان واتە ئەوڕۆحانەی کامڵ بوون و یدی نەگەڕاونەتەوە ناو لاشەکان سەرچاوەی ئەم بیر ایە بوون. ئەوان ئەیانتوانی لەڕێی ئەوەوە لەگەڵم بدوێن. هەنوکە کاترین سەرباری ئەمەی کەئەیتوانی بۆژیانەکانی پێشووی بگەڕێتەوە ئەیتوانی کەناڵی پەیوەندیکردن بەدنیایەکی تریشەوە بێت و زانیاری بەبەها بگوازێتەوە. هەولّم ئەدا عەینیەت گەرایی خۆم بپارێزم.

مەسەلەکە ڕەهەندێکی تری وەرگرتبوو. کاترین لەژیانیدا توێژینەوەکانی دکتۆر(ئیزابت لوبلرراس) یان دکتۆر( ریموند مودی) کەهەردووکیان دەربارەی " ئەزمونەکانی سەرەمەرگ" نوسرابوون نەخوێندبووەوە. وەلەژیانیشیدا دەربارەی کتێبی " مردووەکانی تبت" هیچی نەبیستبوو. کەچی لەئەزمون گەلێ ئەدوا کەلەگەڵ باسەکانی ئەم کتێبەدا چون یەکبوون. ئەمەش بۆخۆی بەڵگەیەکی ترە. بریا ڕاستیەکان

ڕوورترنەبوون، ڕاسەقینەی وەها کەبمتوانیبا جەختیان لەسەربکەمەوە. بەدبینی و گومانم کەم و زیادی ئەکرد بەلاَم هێشتا لەجێی خۆی بوو. پێنەچێ دەربارەی توێژینەوەکانی "سەرەمەرگ" لەگۆڤارێکدا شتێکی خوێندبێتەوە یان گفت و گۆیەکی تەلەفیزیۆنی بینیبێ بەلاَم ئەو ئینکاری وەیاد هێنانەوەی وەها وتارێ یان چاوپێکەوتنێکی دەکرد. ئەشیا ئەم یادەوەریانە لەنەستەوە بوبێ. ئەو زیاتر لەمەبەستەکانی ئەو توێژینەوانە ڕۆچوو بوو ، وەپەیامی لە دونیای ڕۆحەوە دەهێنا. بریا ڕاستی و زانیاری پترم دەبوو.

لەد٠ای بەخەبەر هاتنەوە، کاترین جوزئیاتەکانی ژیانەکانی لەبیر بوو بەلاَم ئەوەی پاش مردنی بەناوی(ئیزابیت) ڕوی دابوو لەبیر نەهات. پاشانیش جوزئیاتەکانی ڕۆحەکانی لەبیر نەهات. تەنها ئەیتوانی ژیانە کۆنەکانی پێشووی لەبیر بێت.

**(( لەڕێی زانست و زانینەوە لەپەروەردگار نزیک ئەبینەوە.))** وەئێمەش لەکارواندا بووین.

---

*گیلێ زمانی سکوتلەندی و ئیرلەندییە.

«خانویەکی چوار گۆشەی سپی دەبینم بەردەمی جادەیەکی بەردەلآنە. سوارەکان لەهاتوچۆدان (دەنگی کاترین ئاسایی و ئارام بوو) . درەخت گەلێ...کێڵگەیەک ، خانوویەکی گەورە لەگەڵ کۆمەڵێ خانووی بچوکتردا هەروەک خانوی بەندەکان لەملاو لایەوە هەن . هەوا زۆر گەرمە . لە باشورین ... "ڤێرجینیا؟"» کاترین لای وابوو ساڵی ۱۸۷۲ بێ . منداڵ بوو .

«ئەسپ و بەروبومێکی زۆر هەن ... گەنمەشامی ، توتن» ئەوو خزمەتکارەکانی دی لەچێشتخانەی باڵاخانەیەکی گەورەدا نانیان دەخوارد ناوی (ئابی)بوو، وە ڕەش پێستیش بو هەستی بە مەترسی کردوو ماسولکەکانی سفت بوون . خانووە گرنگەکە ئاگری گرتبوو ئەویش لە...وتاندن و دارماندنی دەڕوانی . پازدە ساڵ بردمە پێشتر بۆ ساڵی ۱۸۸۸.

«جل و بەرگێکی کۆنەم لەبەرە . خەریکی سڕینی ئاوێنەیەکم لە نهۆمی دووەمی باڵەخانەیەکە ... باڵەخانەیە لەخشت و پەنجەرەی زۆر ... شوشەی زۆرە . ئاوێنەکە ساف نیەو ڕووشاوە . پیاوی خاوەن ماڵ بەناوی (جیمز ماتڤن ) ناو دەبرێ . پاڵتۆیەکی گەورەی سێ قۆپچەی یەخەڕەشی لەبەردایە . ڕیشی هەیە ... ئەو ناناسم (لەژیانی ئێستایدا) . لەگەڵ من خۆش ڕەفتارە . من لەماڵێک لەو مولکەدا دەژیم . پاک و خاوێنی

ژوورەکان ڕادەگرم . قوتابخانەیەک هەیە بەڵام نایەڵن من بچمە ناو خوێندنگەکەوە . من (کەرێ) دروست دەکەم !»

کاترین لەژێر لێوو زۆر هێور دەدوا . وشەی زۆر سادەی بەکاردەهێناو گرنگی بەجوزئیاتەکانیش دەدا . لەماوەی پێنج خولەکی پاشتر ، چۆنیەتی دروست کردنی کەرێ فێربووم . ئەو زانیاریانەی (ئابی) دەربارەی چۆنیەتی دروست کردنی کەرێ دەیزانی بەلای کاترینیشەوە نوێ بوون . ئەوم بردە پێشتر .

«لەگەڵ کەسێکدام ، پێم وابێ هاوسەرین . لەیەک جێدا دەنوین ... بەڵام هەمیشە لەگەڵ یەک نین . هەرچەندە کەسێکی خراپ نییە بەڵام هیچ هەستێکی تایبەتیم بۆ ئەو نیە . منداڵێک نابینم . دار سێوو مراویش هەیە . مرۆڤەکانی دی لێمەوە دوورن . خەریکم سێو لێدەکەمەوە . شتێ چووەتە چاوەکانم و دەیکزێنێتەوە . "چ ەکانی داخستبوو وەدەم وچاویشی گرژکرد. «دوکەڵە . با لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ ... دوکەڵەکە هی سوتاندنی دارە . خەریکن بەرمیلە تەختەکان دەسوتێنن » دەکۆکی . «ئەمە زۆر ڕوو دەدا . خەریکی ڕەشکردنی ناوەوەی بەرمیلە تەختەکانن ... قیر ... لەبەر دژە ئاوو دزەکردنیان »

پاش دیداری پڕ لەتاسەی هەفتەی ڕابردوو ، شەیدای ئەوە بووم دووبارە بگەینەوە حاڵەتی دوای مردن . ئەوە دەخولەکمان تێپەڕاندبوویە ژیانی کارگوزاریەوە . زۆر شت دەربارەی پەردەو کەرێ و بەرمیلە تەختەکان فێر بووم بەڵام من خولیای وانە مەعنەوی و ڕۆحانیەکان بووم . تاقەتم لێبڕاو بردمە وەختی سەرەمەرگی .

«هەناسـەدان دژوارە . سـنگم زۆر دێـشێ » کـاترین بەزەحمـەت هەناسەی دەدا . دیاربوو کە دەرد دەبینێ . « دڵم ژانـەکات . زۆر سـاردە ... لاشـەم دەلـەرزێ » کـاترین دەستی بەلـەرزین کـرد . «خـەڵکانێک لـە ژوورەوەن . جۆرە چاییەکم دەدەنێ تا بینۆشـم. چەشـنە بـۆنێکی هەیـە . ماددەیەکی چەور لە سنگم دەماڵن. شەو ... هەست بـە سارد بوونـەوە دەکەم » دەست بەجێ مرد . سەرباری ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز دەبوەوە دەیتوانی لاشەکەی لەسەر جێ ببینێ . ئەو وەخت پیرەژنێکی بچوك و چـرە کیوو نزیکەی شەست ساڵ بوو . لەو دۆخەدا مابوەوەو چاوەڕێ بـوو کەسـێ بێت و یارمەتی بدات . ئاگای لەدەرکەوتنی ڕووناکیـەك بـوو وەهەسـتی کـرد بـەرەو لای ڕوناکیەکـە بـەکێش دەکرێـت . ڕووناکیەکـە بـەتینترو درەوشاوەتربوو . چرکەکان گوزارشتیان دەکردو لەبێدەنگیا چاوەڕێ بووم . کتوپڕ چووە زەمەنێکی دی لەژیانی هەزاران ساڵ بەر لە(ئابی) .

کاترین بەنەرمی دەیگوت: «سیرێکی زۆر دەبینم لـەژورێکـ، ڕوکـراوەدا هەڵواسـراون . هەسـت بـەبۆنیان دەکـەم . بـاوەڕ وایـە سـیر زۆر لەنەخۆشیەکان لەناو دەباوخوێن پاك دەکاتەوە بەڵام دەبێ هـەموو ڕۆژێ بیخۆین. سیر لە دەرەوەش هەیـە. لەسـەروی باخـچەکە گیـای دەرمـانی تریشی لێیە ... هەنجیرو خورماو شتی تریش . ئەمانە بەسوودن. دایکـم سیرو گیای دەرمانی دەکڕێ. کەسێ لەماڵمانـدا نەخۆشـە. ئـەم گیایانـە ڕیشەیان سەیرە. هەندێ وەخت دەیئاخننە ناو دەم و گوێ و شـوێنەکانی دی .»

«پیرەمێردێکی ڕیشن دەبینم. ئەو یەکێکە لە حەکیمەکانی دێ. پێمـان دەڵێ چی بکەین . چەشنێ ... تاعون هاتوە ... خەڵکی دەکوژێ . لاشەکان

مۆمیا ناکەن چونکە لە نەخۆشیدا رۆح دەرناچێ ! (پێچەوانەی قسەکانی کاترین پاش مردنی) خەڵکێکی زۆر مردون . مەڕومالأتیش لەتیاچوندان ؟ ئاو ... سیل ... خەڵکی بەهۆی سیلەوە نەخۆشکەوتون . (لەو وەختەدا وا بلأوبووە ) منیش بەهۆی ئاوەوە نەخۆشکەوتووم . بووە هۆی ژانە دڵو نەخۆشی گەدەو ڕیخۆڵە . لاشە ئاوێکی زۆر لەدەسدەدەن .من لای ئاوێکم تا گۆزەیە بەرمەوە بۆ ماڵەوە . بەلأم هەر ئەم ئاوە دەمانکوژێ . ئاو دەبەمەوە بۆ ماڵ. دایك و براکانم دەبینم . باوکم مردوە. براکانم زۆر نەخۆشن ».

بەر لەوەی بێمە پێش هەڵوێستەیەکم کرد . سەرسام بووم لەوەی مردن و ژیانی دوای ئەویش و پەیبردنی لەهەر قۆناغێکی جیادا تا ئەو رادەیە جیاواز بوو . سەرباری ئەمە ئەزموونی ئەو لە مردن لە هەر ژیانێکدا چونیەك و هەماهەنگ بوو.

لەسەرەمەرگدا بەشە ئاگاکەی ئەو لە لاشەی جیا دەبووەوەو لەبەرزایدا بەهەلأژاوی دەماوە . دواتر بەرەو ڕووی ڕوناکیەکی سەیرو تین بەخش بەکێش دەکرا . دواتریش چاوەڕوانی کەسێکی دەکرد تابێت و دەستگیرۆی بکات . ڕۆح خۆبەخۆ لەلاشە دەردەچوو . مۆمیایی کردن یان ئەسپەردە کردن یاخود ئەنجامی هەر کارێکی دی پاش مردن هیچ پەیوەندییەکی بەتێپەڕین و ڕۆشتنی ڕۆحەوە نەبوو . ئەم کارە خۆبەخۆ ئەنجامی دەگرت. هیچ جۆرە ئامادە سازییەك پێویست نەبوو وەکو تێپەڕین لە دەروازەیەکەوە کەتازە کرابێتەوە .

«زەوی وشك و بێ سەوزاییە ... لەم دەوروبەرە چیایە نابینم ، تەنها دەشتێکی کاکی بەکاکی و وشك و بەس . برایەکم مردوە. تەندروستیم

باشتربووه بەلام هێشتا ئازارم هەیە .)) بەلام ماوەیەکی زۆر نامێنیّ و دەمریّ .

((لەسەر تەختەیە درێژ ڕاکشاوم)) زۆر نەخۆش بوو . تەنانەت سیرو دەرمانە گیاییەکانی تریش نەیان توانی جلەو گیری لەمردنی بکەن . دەستبەجیّ لەدۆخێکدا کەبەهەلاژاوی بەسەر لاشەی خۆیەوە بوو بەرەو ڕوناکیەکی ئاشنا پەلکێش کراو چاوەڕوانی کەسیّ بوو بەرەو ڕووی بێت .

بەهێواشی سەری بەملاولادا دەسوڕا ، وادیاربوو سەیری شتێکی دەکرد. دووبارە دەنگی بەرزوو خەشم بوو .

((پێم دەڵێن خواوەندێکی زۆر هەن چونکە خودا لەهەر یەك لە دەروونی ئێمەدا هەیە )) بەدەنگە مەعنەوی و پەیام و خەشمەکەیدا زانیم کەئەو دەنگە لەدوای مردنی و لەبەرزە خەوەیە . بەلام ئەوەی پاش ئەوە وتی تاسانفی !

(( باوکت و کوڕەکەت کەمنداڵێکی بچوکە لێرەن . باوکت دەڵیّ دەیناسم چونکە ناوی (ئافروم) ە . کچەکەشت هەر بەو ناوەوە ناونـاوە . مردنی ئەو بەهۆی دڵییەوە بوو . دڵی مناڵەکەشت گرنگ بوو چونکە وەکو دڵی (جوجکە) دواو پێش بوو . ئەو لەپێناو ئەوینی بۆ ئێوە خۆی فیدا کرد. ڕۆحی زۆر پێشکەوتووە ... بەمردنی قەرزەکانی دایك و باوکی دایەوە ، سەرباری ئەمانەش ویستی بۆتان بسەلمێنیّ کەپانتای زانستی پزیشکی سنور دارە )) .

کاترین بیّ دەنگ بوو . زەینی بێحەواسم هەوڵیئەدا مەفهومەکان کۆبکاتەوە ، لەبێدەنگیەکی نامۆدا ڕۆچوو بووم . ژورەکە لەلام وەکو سەهۆڵی لێهاتبوو .

ئەو لەربارەی ژیانی تایبەتی منەوە هیچی نەدەزانی. لەسەر مێزی کارکردنەکەم وێنەی منالّی کچەکەم هەبوو پێدەکەنی و لەناو دەمیا تەنها دوو ددانی خوارەوەی دیار بوو. وێنەی کوڕەکەشم لەلای ئەو وێنەیەدا بوو. جگە لەمانە، کاترین دەربارەی خێزان و کەمێکی مێژووی ژیانم شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی . دەربارەی ڕەوتەکانی چارەسەرە باوەکانی دەروونی زۆرم دەزانی . پزیشکی دەرونی پێویستە وەك لاپەڕەیەکی سپی و ساف بێ تانەخۆش بتوانێ ئیحساس و فیکرەو ڕەفتاری خۆی تیا پێچەوانە بکاتەوە . منیش ئەو مەودا دەرمانیەم لەگەڵ کاترین پاراستبوو. ئەو منی تەنها وەکو پزیشکێکی دەرونی دەناسی و هیچ شتێکی لەژیانی ڕابردووم نەدەزانی . تەنانەت لەعیادەکەشما بڕوانامەکەم لەجێیەکی وادانەنابوو کە ببینرێ.

گەورەترین تراژیدیای ژیانی من مردنی چاوەڕوان نەکراوی یەکەم کوڕمان (ئادام ) بوو لەساڵی ۱۹۷۱ ز . کەمرد تەنها بیست ڕۆژ تەمەنی بوو . دە ڕۆژ پاش ئەوەی لەنەخۆشخانە بردمانەوە بۆماڵ توشی هەناسە گرتن و ڕشانەوەیەکی زۆر بوو . دۆزینەوەی نەخۆشییەکەی زۆر دژار بوو . پێیان وتین خاڵیبونی نائاسایی خوێن هێنەرەکانییەتی لەگەڵ کەم و کوڕی دیواری خوێنبەرەکان . ئەم نەخۆشییە هەر لە دە ملیۆن منداڵی لەدایکبوو یەکجار ڕوو دەدات . هاتووچۆی خوێنهێنەرەکانی سی بۆ دڵ ، کەخوێن بە ئۆکسجینەوە دەباتەوە بۆ دڵ ، هەڵە بوو ! وەکو ئەوە بوو دڵ هەڵسوڕابێتەوەو دواو پێشی کردبێ . ئەم نەخۆشییە زۆر زۆر نادروستە .

تەنانەت نۆژداری دڵیش نەیتوانی (ئادام) کەچەند ڕۆژێ پاش ئەوە مرد ڕزگار بکات . ئێمەش بۆ چەند مانگێ ماتەمیمان گرت و هەموو ئارەزوو

ئومێدەکانمان لەگۆڕنران . کوڕەکەی ترمان (جردن) ساڵێ دواتر لەدایك بـوو وەك مەرهەمێ نرا لەسەر زامەکانمان .

کە (ئادام ) مـرد دوو دڵ بـووم لەهەڵبـژاردنی پزیـشکی دەروونـی وەکـو پیشەی داهاتووم . ئەوە بوو بڕیارم دا ببمە پزیشکی دەرونی . جاڕس بـووم لـەوەی پزیـشکی مـۆدێرن نـەیتوانی بـوو بەوهـەموو توانـاو لێهاتوییانـەوە کوڕەکەم، ئەو منداڵە ساوایە لە چنگی مردن دەربێنێ .

باوکم هەتا تەمەنی شەست و یەك ساڵی تەندروستی باش بوو . تاساڵی ١٩٧٩ توشی جەڵدەی دڵ بوو . لەجەڵدەی یەکەم دەرباز بوو بەڵام دیـواری دڵی نەگەڕایەوە باری ئاسایی خـۆی و زیـانی پێگەیانـدبوو وەسـێ ڕۆژ پـاش ئەوە گیانی لەدەست دا . ئەم ڕوداوە نۆ مانگ بـەر لەیەکـەم دیـدارم لەگـەڵ کاترین ڕوویدابوو .

باوکم پیـاوێکی موتـەدەین"ب ـدار" بـوو ، زیـاتر لـەوەی ڕۆحـانی بـێ، پابەندی ئـاداب و دەسـتوری مەزهـەب بـوو . مەزهەبەکـەی، نـاوی (ئـاوروم ) گونجاوتر لەناوە ئینگلیزیەکەی (ئالوین)بوو . چوار مانگ دوای مردنـی ئـەو، کچەکەمان (ئیمی) لەدایك بوو هەربەناوی باوکمەوە ناومان نا .

ئێـستەش لەسـاڵی ١٩٨٢ لـەعیادە مـات و تارەکەمـدا زنجیرەیـە دارو پـەردووی نادیـار بەسـەرما دەڕمـا. لەدەریایـەکی ڕۆحانیـدا مەلـەم ئـەکردوو عاشقی ئەو ئاوەش بووم.

زانینی ئەو ڕووداوانە بۆ کاترین ئەستەم بوو. لەپێناو وەدەسهێنانی ئەم شتانەدا پێنەئەچوو سەردانی جێیەکی کردبێ یان کتێبێکـی خوێندبێتـەوە . ناوی عیـبری بـاوکم ، مردنـی کوڕەکـەم لەنەخۆشـیەکی دەملیـۆن یـەکی و ، زەین و ئەندێشەکانم دەربارەی پزیشکی و مردنی باوکم و ناونانی کچەکەم .

هەمووئەمانە ڕاست بوون. ئەم شاگردە ئاساییەی ناو تاقیگە گەنجینەیەکی زانیاری لەپشتەوە هەبوو. ئەگەر ئەیتوانی ئەوڕاستیانە ئاشکرا بکات ئەی چ شتانێکی دی هەبوون؟ پێویست بوو زیاترم بزانیبا.

(( کێ لەوێیە؟ کێ ئەمانەت پێئەڵێ؟))

**(( ڕۆحەکان ، ڕۆحەمەزنەکان پێمئەڵێن. دەڵێن کەمن هەشتاو شەش جار لەلاشەکاندا ژیاووم.))**

هەناسەی کاترین خاوبووبووەوە. سەری لەسوڕاندن بەملاولادا وەستان. پشوی ئەدا . ئەمویست بەردەوامبم بەڵام تێگەشتنی ئەوانەی کەگوێتبووی زەینمی پەرتو بڵاو ئەکرد. ئایا دەشیا ڕۆحەمەزن و مورشیدەکان ڕاستیبن؟! ئایا دەشیا ژیانی ئێمە بەهۆی ڕۆح گەلێکەوە کەتەنها ڕۆحن و لاشەیان نییە بەڵام ئەگونجێ خاوەنی زانستێکی زۆربن ڕێنومایی بکرێ؟ ئایا بۆگەشتن بەپەروەردگار پلە بەندی هەیە؟ ئەم شتانە ڕاست بوون؟ بەگرنگی دان و ئاوردانەوە بەوانەی کاترین گوێتبونی جێی گومان نەبوو بەڵام هێشتا باوەڕکردنیان دژواربوو. لەزیهن و قوڵایی ناخما ئەمزانی ڕاستنەکات. ئەو خەریکی ئاشکرا کردنی ڕاستییەکان بوو. ئەی کوڕەکەم چی ؟ بەمانایەکی دی ئەوان هێشتا زیندو بوون و هەرگیز نەمردبوون . ماوەیەکی زۆر پاش لەئەسپەردە کردنیان لەگەڵما دەدوان . ئەمە بەپێدانی زانیاری نهێنی و تایبەت دەسەلمێنێ . بابڵێین ئەمانە ڕاست بوون، ئایا کوڕەکەم بەو چەشنەی کاترین دەیگوت دەشیا لەلایەنی ڕۆحیەوە هێندە پێشکەوتە بێ ؟ ڕازی بوو لە خێزانی ئێمەدا لەدایك بێت و لەپێناو دانەوەی قەرزو کارمایەی ئێمەو دواتریش فێرکاری من لەبواری پزیشکی و مرۆڤ و ئەعصاب بیست و سێ ڕۆژ دوای ئەوە بمرێ ؟ هێزی دڵم بەم بیرکردنەوانە زیادی دەکرد .

هەستم کرد عەشقێکی گەورەو یەك بوون لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدا هەیە. دڵم بۆ باوکم و کوڕەکەم تەنگ دەبوو . خۆشحاڵ بووم لەوەی کە هەوالێکم لەوانەوە پێدەگەیشت .

ژیانی من چیدی وەکوپێشتر نەبوو. دەستیێ هاتووەو ڕەوتی ژیانم بەچەشنێك کە شایەنی گەڕانەوە نەبێ گۆڕیوە . گشت موتالآکانم کەبەوردی و بێلایەنی و بێ باوەڕانە ئەنجامم دابون شوێن پێی خۆیان کردەوە . یادگاری و پەیامەکانی کاترین ڕاستی بوون . هەستی بینین (شهود) ی من دەربارەی باسەکان لام دروست بوو لەگەڵ ڕاستیەکاندا ڕووبەڕووم و بەڵگەشم هەبوو .

جگە لەمانەو تەنانەت لەساتی شادی و دەرك پێکردن و ساتی ئەزمونی باتنی ، زەینی ـ لۆژیکە بەگومان و درەنگ ئاشناکەمی ناڕەزایی دەرکرد . ئەشێ ئەمە تەنها ( ١٠ستی شەشەم ) یان توانایەکی ڕۆحی بێت . باشە گەروابێ ئەم تواناو لێهاتوییە گەڕانەوەی دوەبارەی رۆح بۆ لاشەو یاخود بونی رۆحە مورشیدەکان پشت ڕاست ناکاتەوە . بەڵام ئەم جارە ئیدی نەخڵەتام . هەزاران باس و لێکۆڵینەوە کەلەنوسراوە زانستیەکاندا هاتبوون بەتایبەت ئەو منالآنەی کەبەزمانێکی بێگانە کەلەخەویشدا شتی وایان نەدیتبوو ، وەهادەدوان . دەربارەی ناوچەیە کە پێشتر زامێکی کوشندەیان لەکۆڵ نابوو ، دەربارەی ئەو منالآنەی کەدەیانزانی گەنجینەیە یان شتێ لەهەزاران میل دوورترو یاخود دەیان و سەدانی دی کەپێشتر ئەسپەردە کراون هەموو قسەکانی کاترینیان دەکردەوە . من کەسایەتی کاترینم دەناسی ئەوەی هەبوو نەبوو دەمزانی . نا ئەم جارە زەینم نەیدەتوانی گومڕام بکات . بەڵگەکان پتر بەهێزو گشتگیرتربون . ئەمە ڕاستی بوو .

هەروا کەدانیشتنی هیپنۆتیزم بەردەوام دەبوو کاترین پتروپتر پێداگری لەسەر ئەم مەسەلانە دەکردەوە .

بەدرێژای حەفتەی دواتر جارجارە پێداویستی و کاریگەری ئەم دانیشتنانەی هیپنۆیزمم لەبیردەکرد . هەر جارەو دەرگیری ڕەوشتی کۆن و ژیانی ئەمڕۆ و نیگەرانی کارە ئاساییەکانم دەبووم و گومان و دوو دڵییەکانم پەرەیان دەسەند . وەختێ زەینم چەق بەستوو نەبوو مەیلی بەلای گەڕانەوە بۆ دۆخەکانی قەدیمی و بیرو باوەڕەکانیان نەبوو . ئەوسا بەخۆمم دەووت ئایا بەڕاست ئەمە ڕوویدا ؟ تێگەیشتم باوەڕبوون بەم چەمکانە بەبێ بوونی ئەزمونی شەخسی چەندە دژوارە لەبەرئەوە ئەگەر بەدەرکی زەینمان باوەڕی ئیحساسیش بنێینە بانی هێشتاهەر ئەزمون کردنی پێویستە . هەرچۆنێك بێت کاریگەری ئەزمونی شەخسی تائەندازەیە بەرەو نەمان دەچێ .

سەرەتا بەئاگا نەبووم لە هۆکاری ئەو گۆڕانەی لەبونما دەهات . دەمزانی هێورو ئارامتر بوم و هەرواشیان پێدەگوتم . هەستم دەکرد لەژیانمدا ئومێدو شادی و ئامانج و قابلبونێکی پتر دەرکەوتوون . پەیم دەبرد کەم کەم خەریکە ترس لەمردن لەدەست دەدەم . لەمەرگ و لەنەمانی خۆم نەدەترسام . لەوەش نەدەترسام دۆستەکانم لەدەست بدەم . هەرچەند بیرم دەکردن . ئای چەندە ترس لەمردن هێزبەخشە ! خەڵکی لەپێناو هەڵهاتن لەم ترسە بەرگەی هەموو دەردەسەریە دەگرن . قەیرانەکانی پیریەتی ، پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ لەخۆمان لاوترو ، نۆژداریە جوانکارییەکان و وەسواسی لەتەمرینە وەرزشیەکاندا ، کۆکردنەوەی ماڵو سامان ، منداڵبوون بەخاتری مانەوەی ناوو کۆشش دان

لـەپێناو مانـەوە بەلاویـەتی و ... ئـای ئێمـە چـەندە زۆر بـیر لەمـەرگ دەکەینەوە ! تەنانەت جاریوایشە تائـەو ئاستەی کـەئامانجی ڕاستەقینەی ژیانمان لەبیر دەکەین .

منیش وەخت بوو وەسواسیەکانی خـۆمم لەدەست دەدا . پێویـست نـەبوو بەردەوام خۆم کۆنترۆڵبکەم . هەرچـەند هـەوڵم دەدا کـەمتر جدی بم بـەڵام گۆڕنی ئەم ڕەفتارانە لەلام دژوار بوون . هێشتا دەبوا شتی زیاتر فێربم.

لەئێستا بەدوا ئەو ئەگەرو ئەستەمانەی کاترین دەیگوتن و دەشیا ڕاست بوونایە زەینم وەریدەگرتن . وەدەستهاتنی ئـەو ڕاستیە ناوازانـە لـەبارەی بـاوك و کوڕەکەمـەوە لـەڕێی هەسـتی ئاسـاییەوە سروشـتی نـەبوو . بەدڵنیاییەوە زانست و تواناکانی ئەو دەربڕی هێزێکی ڕۆحی نـاوازە بـوون . بـاوەڕکردنی مـەنتقی بـوو بـەڵام دەربـارەی ئـەوەی لـە نوسـینەکاندا دەمخوێند ئـەوە بـەگومان و پـارێزەری کـاری خـۆم بـووم . خـەڵکانێ کەدەربارەی تەجەلی و نمایانی ڕۆح و ، ژیانی دوای مردن و شتە نائاسایی و سەمەرەکانی دەدوان کێ بوون ؟ ئایا لە کۆرس و ڕەوشە زانستیە کرداری و جـەخت کراوەکانـدا خوێنـدبوویان ؟ سـەرباری ئەزمونـە گـشتگرو سەرسوڕمانەکەم لەگەڵ کاترین زەینی ڕەخنەگرم هەر ڕاستی و زانیارییـەکی نوێی تاوتوێ دەکرد . تاوتوێم دەکرد تا بزانم ئایا لە چوارچێوەیە کە لەهـەر دیدارێکدا لەگەڵ کاترین پتەوتر دەبوو ، شوێن پێدەگرێ یـان نـەء. ئـەوەم بەدیقەتی زانایەك لەهەر گۆشەیەکەوە دەمخستە ژێر ووردبینەوەو وادیـاربوو نەم دەتوانیئنکولّی ئەوە بکەم کـە چوار چێوەکە شـکڵ گرتـوو وە بـوونی هەبوو .

هێشتا لەنیوەی ئەو هیینۆتبزمەدا بووین کاترین کۆتایی بەپشووەکەی هێناو هاتە دووان دەربارەی ئەو موجەسەم (پەیکەر) انەی کەلەبەردەم پەرستگایەکدا بوون . منیش لەو دۆخی جەزبەوکوڵانە هاتمە دەرەوەو گوێم گرت . لەقۆناغی ژیانێکی قەدیمیدا بوو ، شوێنێك بوو لەئاسیا بەلام من زەینم هەر لای رۆحە مەزنەکان بوو . بیرم لێ دەکردەوە ئەمە موعجیزەیە . ئەو دەربارەی ژیانە پێشوەکان و گەڕانەوەی دووبارەی ڕۆح بۆ لاشە دەدوێ . بەلام ئەمانە لەبەرامبەر پەیامەکانی رۆحە مورشیدو مەزنەکان هێندە سەرنج ڕاکێش نین . تێگەیشتم بەر لەوەی بتوانێ بچێتە بەرزەخەوە دەبوو قۆناغێکی ژیانی بڕیبێ دەنا نەیدەتوانی یەکسەرە بچێتە ئەو دۆخەوە ، تەنها لەدوای تەواو بونی ژیانێك بەوچەشنە ئەیتوانی پەیوەندی بکات بەرۆحەکانەوە .

بەنەرمیەوە وتی : الژمارەیە مجەسەمەی سەوز لەبەردەم پەرستگایەکدان . منارەو گومەزی بچوك بچوکی قاوەیی لەسەر پەرستگاکەن . لەبەردەمیا حەڤدە پێ پلیکانە هەیە . ئەگەر بەوا بچیە سەر دەگەیتە ژورێ . بغوردێکی خۆش دەسوتێ . کەس پێلاوی لەپیانیە . خەڵکانی ئەوێ سەریان تاشراوە . دەم و چاویان خڕو چاو ڕەشن . پێستیشیان ڕەشە . من لەوێم . پێم ئازاری هەیەو بۆ شیفا چوم بۆ ئەوێ . قاچم تلۆقی کردوە . ناتوانم لەسەری ڕاوەستم . شتێ چووە بەقاچما .

گەلا لەسەر پێم دادەنێن... گەلای سەیر سەیر... تانیس ؟ ( تانیس یان ئەسیدی تانیك بەشێوەیەکی سروشتی لەڕەگی دارو پێستی درەخت وگەلای میوەو زۆری تر لەگیاکان هەن ، هەر لەکۆنەوە تا ئێستاش وەکو دەرمان بەکاری دێنن چونکە خوێن کۆدەکاتەوەو دەیمەیەنێ ) سەرەتا قاچیان پاکردمەوە . ئەمە ڕێ و ڕەسمێکە لەبەرامبەر خوداکاندا ئەنجام دەدرێ . ژەهرێ لەپێم دایە . پێم لەسەر شتێ داناوە . ئەژنۆم تلۆقی کردووە . قاچم فورس بووەو خەت و خاڵی لەسەرە (ژەهراوی بونی خوێن ؟) . ناو لەپی پێم هەڵدەکوڵن و شتێکی زۆر داغ دەنێنە بانی » .

کاترین لەتاو ئازار گلینگی دەخوارد . ئێلنجی لەشەربەتێکی تاڵ دەهات کەدەرخواردیان دابوو . ئەم شەربەتە لەگەلای زەرد دروستکرابوو وەشفای دا بەلام ئێسکی قاچ و پێی وەکو پێشتر نەبوون . لەزەمەن بردمە پێشتر . تەنها ژیانێکی هەژار دیدەی ئەبینی . لەگەڵ خێزانەکەیدا لەخانۆچکەیەکدا لەژورێ مێزیشی تیانەبوو دەژیان . برنجی ئەو کاتەیان دەخوارد بەلام هەمیشە برسی بوون . زۆر زوو پیر بوو . برسێتی و هەژاری هەرگیز دەست بەرداریان نەبوون تا مرد . تاوێ وەستام . هەستم بە ماندووبونی دەکرد . بەرلەوەی خەبەری بکەمەوە وتی : « (ڕۆبێرت جارود) پێویستی بەیارمەتی تۆ هەیە .» نەمزانی ڕۆبێرت جارود کێیەو چۆن دەتوانم یارمەتی بەم . هیچی تر نەبوو .

پاش بێداربونەوەی هەندێکیتر لەیادگاریەکانی ڕابردووی بیر هاتەوە . بەلام لەئەزموونەکانی پاش مردن و بەرزەخ و ، ڕۆحە مەزنەکان و ئەو زانیارییە موعجیزە ئاسایەی کە دەری خستبوو هیچ شتێکی لەبیر نەدەهات. لێم پرسی :

((کـاترین : چـەمکی رۆحـە مورشـیدو مەزنـەکان چ مانایـەکی هەیـە لەلات؟)) هیچ رایەکی دەربارەی نەبوو ! بەخێرای ڕوو لەچاکبوون بوو بەڵام هێشتا نەیـدەتوانی بابـەتی گەڕانـەوەی دووبـارەی رۆح بـۆ لاشـە لەگـەڵ مەزهەبەکەیدا یەکلاو یەکانگیر کات . ئیتر بڕیارم دا دەربارەی ڕۆحەکان هیچ شتێکی لا نەدرکێنم . سـەرباری ئەمانـە نەمـدەزانی چـۆن چـۆنی پێـی بڵـێم کەئەو نێوەندێکی باشەو دەتوانێ زانیاری پشت ڕۆحە مەزنەکان نقلێ بکات .

کاترین ڕازی بوو بەوەی لەدانیشتنی دواترماندا هاوسەرەکەشم ئامادە بێ . (کارول ) یارمەتی دەری کۆمەڵایەتی لـە دەروون(ئەعصاب) دایـەو زۆر لێهـاتوو شـارەزایە لـە کارەکەیـداو کۆرسـی تایبـەتی دیـوەو مـن دەمویـست بۆچـوونی ئـەو دەربـارەی ئـەم ڕاسـتییە بـاوەڕ پێنـەکراوە وەرگـرم . دوای ئەوەی پێم وت کاترین باسی باوکم و کوڕەکـەمانی کـردوە پێـی خـۆش بـوو یارمەتی بدات . کێشەم نەبوو 'ەنوسینەوەی ئـەوەی کـاترین وشـە بـە وشـە دەیووتن. بەڵام ڕۆحـەکان زۆر خێـرا دەدوان . ئـیتر برـارم دا هـەموو شـتێ لەسەر کاسێت تۆمار بکەم .

هەفتەیە پاش ئەوە کاترین بۆ هیپنۆتیزم هات . ترس و نیگەرانیـەکانی کەمتر بـوون و ڕۆژ بە ڕۆژ تەندروستی باشتردەبوو. چاکبونەکەی پێوە دیـار بوو بەڵام هیشتا دڵنیا نەبووم هۆی چاکبونەکەی چییە. نـوقم بـونی بـەناوی (ئارونـدا) ، بڕینـی گـەروی بـەناوی (یوهـان ) و قوربـانی نەخۆشـییە لـەئاو بـەناوی (لـوئیزا) و زەبـرە ڕۆحیـە کوشـندەکانی وەبـیر دەهێنـا . ژیـانی هـەژاریو ڕفانـدنو دەسـتدرێژی کردنەسـەری چـەند جـارەی دیتبـوو . نمونەکانی ئەم دواییەی زەبری بچوکن لەم قۆناغەی ئێمەدا . یاد هێنانەوەی ژیانەکانی پێشوی بـۆ زەبـرە ڕۆحیـەکان دەیتـوانی یارمـەتی چـاکبونەوەی

بدات . بەڵام ئەگەرێکی تریش لە ئارابوو ئایا خودی ئەزمونی ڕۆحی دەیتوانی یارمەتی باشتر بوونی بێت ؟ ئایا زانینی ئەمەی کەمردن ، ئەو شتەی کەوادەزانرێ نییە دەیتوانی هۆکاری چاکبونەوەو کەمکردنەوەی ترسەکانی بێ ؟ .

ئایا ئەم ڕەوشە نەك هەر بەتەنها یادگاری ، دەیتوانی ڕەوشێکی چارەسەرکردن بێت ؟

توانا ڕۆحیەکانی کاترین روو لەزیاد بوون بوون و ڕۆژ بەڕۆژ زیرەکتردەبوو . هێشتا کێشەکانی لەگەڵ (ئیشتوارت) تەواو نەبووبوو بەڵام دەیتوانی لەگەڵی بژی . چاوەکانی دەدرەوشانەوەو پێستی ناسك بووبوون . وتی کەلەم هەفتەیەدا خەوێکی سەیری دیبووە بەڵام تەنها بەشێکی کەمی ئەو خەوەی لەبیر دەهات . خەوی دیبوو کە پەڕپەڕەی ماسیە سورێکی لەدەستا بووە . بەزووی و بەئاسانی لەماوەی چەند خولەکێکدا چووە هینپۆتیزم و خەوێکی قوڵەوە .

«گابەردێ دەبینم لەسەریان وەستاوم و سەیری خوارەوە دەکەم . بەنیازم بەدووی کەشتیا بگەڕێم و فەرمانە دەبێ ئەم کارە بکەم ... جلێکی شینم لەبەرە . جۆرە شەرواڵکی شین ... شەرواڵی کورت و پێڵاوی سەمەرە ... پێڵاوی ڕەش و ... ئەڵقە بەسەرەوە بوو ، زۆر گاڵتە جاڕین ... هیچ کەشتیەلە ئاسۆوە دیار نیە .» لەزەمەن بردمە پێش تا بەڕوداوێکی گرنگ لە ژیانیدا بگات .

« ئێمە ئاو جۆ " بیرە" دەخۆینەوە ، بیرەی قورس و زۆر ڕەش . بەرمیلە تەختەکان زۆر کۆنن . بەسیم بەیەکەوە بەسراون . ئێرە زۆر

بۆنی ناخۆشە . خـەڵکێکی زۆر لێـرەن . دەنگـەکانی زۆر بـەرزن . گـشت خەڵکی قسە دەکەن ، پڕ لە دەنگ و هەرایە » .

« کریـستین ... نـاوم کریـستینە . » دووبـارە بوویـووەوە بـەپیاو . «گوشـت و ئـاوجۆ دەخـۆین . ئـاوجۆ یـە کـە زۆر ڕەش وتاڵـە . خـوێی تێدەکەن .»

نەیدەتوانی بزانێ سـاڵی چـەندە . «لـە بـارەی جەنگێکـەوە دەدوێـن ، ئەگەر بێدەنگ بوونایە دەمتوانی ببیستم ، بەڵام هەموان قسە دەکـەن و جەنجاڵە » .

لێم پرسی کوێیە « "هەمستەد" ... بەندەرێکە . بەندەرێکی دەریاییە لە (ڤالز) بەفۆنەتیکی بەریتانی دەدوێن »

لەزەمەن چووە پێش و گەشتە شوێنێ لەکەشـتییەکدا بـوو . «هەسـت بەبۆنی شتێ دە~ەم ، وەختە دەسوتێ . بۆنێکی سامناکە . بـۆنی سـو~ ی دار ، جگە لەوەش شتێکی تریش دەسوتێ . دەماغ دەهەژێنێ ... لەدوور دەست شتێ گـڕی گرتـووە ، کەشـتیە ، کەشـتیەکی چـارۆکەدار . ئێمـە خەریکی شت هەڵگرتنین ! شتێک لەگـەڵ بـاروت هەڵـدەگرین .» کـاترین خەریبوو دەشڵەژا .

«شتێکە لەگەڵ باروت ، زۆر ڕەشە. دەنوسێ بەدەستەوە . ئەبێ خێرا بڕۆین . کەشتیەکە ئالآیەکی سەوزی پێوەیە . ئالآیەکی تـار ... ئالآیـەکی زەردوو سەوزە . تاجێك و سێ نوکی تیژ بەئالآکەوەیە ».

کاترین لەپڕ لەتاو ئازار گلینگی دەخوارد . ئازاری دەچەشت .

«ئاخ دەستم ئازاری هەیە ، دەسـتم دێـشێ ! کانزایـە لەدەسـتمایە . ئەمسوتێنێ ! ئاخ ! ئاخ !»

ئەو بەشەی خەوەکەیم بیر هێنایەوە کەشتێکی وەکو پەڕپەڕەی ماسی لەدەستابوو . ئێستە زانیم و جڵەو گیریم لەئازارەکە گرت . بەڵام ئەو هێشتا هەر دەیناڵاند .

« تەراشەکان لەکانزان ... ئەو کەشتیەی کەئێمە سواری بووین لەناو چوو ... لەلای بەندەرەکەوە ئاگریان کردۆتەوە . خەڵکێکی زۆر کوژراون ... پیاوانێکی زۆر ... من ماوم ... هەر دەستم ئازاری پێ گەشتووە ، بەڵام ور ه وردە چاك دەبێت .» لەو زەنەمەش تێم پەڕاندو هێشتم تا کارەساتێکی گرنگتر دیاری بکات .

«چاپخانەیە دەبینم شتێ چاپ دەکەن. کتێبەکان چاپو جەڵد دەکەن ... جەڵدی کتێبەکان چەرمین و بەندەکانو پەرەکان پێکەوە دەبەستن ، بەندەکان چەرمین . کتێبێکی سور دەبینم ... کتێبێکە دەربارەی مێژوو . ناتوانم ناونیشانەکەی بنم ! هێشتا لە چاپ تەواو نەبووە . کتێبی باشن ، فێری زۆر شتمان دەکەن » .

دیار بوو (کریستین) چێژ لەدیتن و دەسلێدانی کتێبەکان دەبات و دەشیزانی دەتوانێ لەم ڕێگەوە فێری شت ببێ بەڵام وادیاربوو خوێندەواریەکی ئەوتۆی نیبە . بردمە کۆتا ڕۆژی ژیانی .

« پردێ دەبینم بەسەر ڕوبارێکەوە . من پیرە مێردێکم ... زۆر پیرم . هەڵسان و دانیشتنم دژوارە . بەسەر پردەکەدا دەڕۆم ... بەلایەکی تردا ... هەست بەئازارێ دەکەم لەسنگما ، فشار.. فشاری ئازاری مەترسیدار لە سنگما ! ئاخ » کاترین دەنگ لەگەروی دەهاتەدەرو هەستی بەو ئازاری دڵە دەکرد کە کریستین لەسەرپردەکە هەیبوو . هەناسەدانی توندبوو وە گەردن و دەم و چاوی عەرەقی دەکرد . دەستیکرد بەکۆکین

بەسەختی هەناسەی دەدا . ترسام لەوەی ئایا بەسەرکردنەوەی فشارێکی دڵ لەژیانێکی پێشویدا مەترسیدار بوو ؟ کەس وەڵامی ئەوەی نەدەزانی . دواجار مرد . هەنوکە کاترین لەسە قەنەفەکە ڕاکشابوو ، هەناسەدانی قوڵ و یەك ڕەنگ بوو . منیش نەفەسێکی ئاسودەم کێشا .

**«هەست بە ڕەهایی ئەکەم ... ڕەهایی . لەتاریکیدا هەڵاژاوم ... لەملاو لامەوە ڕوناکیە هەیە ... وە ڕۆحی خەڵکانی تریش »** .

پێموت ڕای چۆنە دەربارەی ئەو ژیانەی کەئێستە کۆتای پێهاتووە ، واتە ژیانی بەناوی کریستین .

**« ئەبوو بەخشندەتر بومایە ، بەڵام وا نەبوم . ئەوکەسانەم نەبەخشی کە بەڵایان بەسەردا هێنام ، دەبوو ئەمەم بکردایە . من لەهیچ هەڵەیە خۆش نەبووم ، ئەوانەم بۆسالآنێکی زۆر لەناخمدا هێشتەوە ... چاوە ٘ن دەبینم ... چاوەکان »** .

هەستم کرد پەیوەندی دروستبووە ، وتم: ((چاوەکان ؟ چاوانی کێ دەبینی ؟))

لەژێر لێوەوە وتی : **« چاوەکانی ڕۆحە مەزنەکان ، بەڵام ئەبێ ئارامگربم ، شتی زۆر هەن پێویستە بیریان لێبکەمەوە»**

چەند ساتێ بەبێدەنگی ڕۆیشت .

بێدەنگیە دوورو درێژەکەم شکاند : ((چۆن ئەزانی و ئەوان کەی هاتن؟))

وەڵامی دایەوە : **« ئەوان بانگم ئەکەن »** تاوێکی زیاتر تێپەڕی . پاشان لەپڕدا سەری بەملاو بەولادا دەسوڕاندو دەنگی توندو خەشم بوو واینیشان ئەدا گۆڕاوە .

(( لەم ناوەندەدا ڕۆحێکی زۆری لێیـە ، مـن تـەنها ڕۆحـی ئێـرە نـیم . پێویستە هێـور بـین . ئەمـە وانەیەکـە مـن هـەرگیز فێـری نـەبووم ... مەودایەکی زۆر هەیە ... )) لێم پرسی ئایا بەر لەوە لێرەدا بووە چوەتە ناو لاشەکانی ترەوە .

(( من لەزەمەنە جۆراو جۆرەکاندا ، لەپلەی جۆراو جۆردا بووم . هـەر قۆناغێ پلەیەکی بالاٌترە لەئاگای و هەسـتی مـرۆڤ. ڕۆشـتنی ئێمـەش بـۆ پلەیەکی تر پەیوەندی بەوەوە هەیە تا چر ادەیـەک پێـشکەوتووین ... )) دووبارە بێدەنگ بوو . وتم پێویستە فێری کام وانەبین تا پێشکەوین . گورج وەلاٌمی دامەوە .

((ئەبێ فێر بین زانیاریەکانمان فێری خەڵکانی تر بکەین، وە تواناکانمان زۆر زیاترە لەوەی بەکاری دێـنین . هەنـدێ لەئێمـە زوتـر هەسـت بـەم شتانە دەکـ ـن . ئادەمی پێویستە فێر ببێ بەرلەوەی بگاتە ئـەم ب ـزەخـە ڕەفتارە بەدەکانی کۆنترۆڵ بکات . ئەگەر وانەکات ، ئـەو شـتانە لەگـەڵ خۆی دەباتە قۆناغێکی تری ژیانیەوە . تەنها کاتێک لەلاشـەی خۆمانـداین دەتوانین خۆمان ڕزگار کەین لەو شەڕە خراپانـەی کەتیاماندایـە . ڕۆحـە مورشیدەکان ناتوانن ئەم کارەمان بۆ ئەنجام بەن . ئەگەر بەرگە بگری‌و زوو خۆتیان لێ ڕزگار نەکەیت ئەوە لەگـەڵ خـۆت دەیبەیتـە ژیـانێکیتر . تەنها زەمەنێ کەدڵنیا بوویت بەئەندازەی پێویست بەهێز بیت و بەسەر گرفتەکاندا سەرکەویت ، ئیتر ئەوانە لەژیانی دواترتاندا نابینی)) .

((پێویستە فێر بین لەمەسیرێکەوە لەگەڵ کەسـانێکدا نـەڕۆین کـەهاو مەزهەب و پلـەمانن . سروشـتیەکە بـەرەو لای کەسـێ بـەکێش دەبـین

کەهاوپلەمانە بەلاَم ئەمە هەڵەیە . پێویستە بەرەو لای کەسێکیش کە وەک ئێمە نیە بچیت تابتوانیت یارمەتیان بەیت » .

« هێزی دمرەکی بینین "شهود" ادەرکی هەستی ) بەئێمە بەخشراوە. دەبێ پەیرەوی لێبکەین و لەبەردەمیا ملەجیرە نەکەین . ئەوانەی ملە جیرە دەکەن توشی مەترسی دەبنەوە لە پلەیەکدا ، دەرەقەتی هێزی بەرامبەرو وەک خۆشمان نایەین . هەندێکمان هێزەکانمان پترە لەوانی دی ، چونکە ئەم هێزانە لەزەمەنە جیاوازەکانەوە چنگکەوتوون . بەهۆی ئەمەشەوەیەخەڵکی وەک یەک نابن . بەلاَم دواجار دەگەنە شوێنێ هەموان یەکسان دەبن » .

کاترین بێدەنگ بوو . ئەمزانی ئەمە فیکری ئەو نەبوون . ئەو لەفیزیك و میتافیزیك رابردوویەکی نەبوو . وە دەربارەی پلەکانی دوای مردن و ـ هتد ... هیچی نەدەزانی ، سەرباری ئەمانەش جـ 'نی وشەو فیکرو چەمکی فەلسەفەی گوتەکانی هەموو لەودیو تواناکانیەوە بوو . ئەو قەت ئاوا پوخت و شاعیرانە نەدوابوو . هەستم دەکرد هێزێکی بالاَ دەیویست لەرێی زەین و ژێ دەنگیەکانیەوە ئەم فیکرانە بەم وشانە دەربرێ تا شایانی تێگەیشتنیان بم. نا ئەمە کاترین نەبوو . قسەکانی دۆخی خەواڵوییان هەبوو :

« کەسانێ کەلە بێهۆشیدان ... بەئاوێزانی دەمێننەوەو هێشتا ئامادەیی گوزەر لەم پلەوە بۆ پلەیەکی تریان نیە ... تائەو ساتەی کەبڕیار بدەن ئایا مەیلی گواستنەوەیان هەیە یان نە . تەنیا خۆیان ئەتوانن ئەم بڕیارە بدەن . بەم چەشنە ئەگەر هەست بکەن لەناو لاشەیاندا شتێ بۆ فێربوون نەماوە ئەوسا مۆڵەتی کۆچیان پێدەدرێ . بەلاَم ئەگەر بڕیار بێ شتی زۆرتر فێر بن ، تەنانەت ئەگەر نەشیانەوێ

بگەڕێنەوە هەر ناچارن بگەڕێنەوە . بۆ ئـەو کەسـانە بێهۆشـی قۆنـاغێکی پشوو دانە . قۆناغێکە زەین تیایدا دەتوانێ پشوو بدات » .

سەرباری ئەوەی ئەو کەسانەی لە بێهۆشیدان بەسەرنجدان لەوەی تـا چ ئەندازەیە ئەبێ فێربن لەلاشـەی خویـان دا ، دەتـوانن بڕیـاری گەڕانـەوەیات بدەن . ئەگەر هەستبکەن شتێکی ئەوتۆ نەماوە بۆ فێربون ، بەبێ لەبەرچاو گرتنی پزیشکی نوێ ئەتوانن ڕاستەوخۆ بـچنە پلـەی ڕۆح . ئـەم بابەتـە زۆر چاك هاوتایە لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی ( ئـەزمونی سـەرەمەرگ ) کراون و ئەمەی کـە بۆچـی هەنـدێ کـەس گەڕانـەوە هەڵدەبـژێرن . مۆڵـەتی تێپەڕین بەهەندێ کەسیتر نادرێ چونکە شتی زۆر ماوە فێری بن لەدونیادا . ئـەوەش بڵـێم هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە (ئەزمونـەکانی سـەرەمەرگ ) یـان بڵاوکراوەتەوە گەڕاونەتەوە لاشەکانیان . داستانەکانیشیان زۆری چونیەکە. ئـەوان لەلاشـەیان جـودا دەبنـەوەو دەڕوانـن لـەخۆیـ . دواجـار نـورێکی درەخشان یا کەسـێکی ،ۆحـانی لەمەودایـەکی دوور دەبیـنن ، بـەم چەشـنە هەست بەئازار ناکەن . بەڵام کاتێ زانییان فەرمانەکانیان لەسەر زەوی تەواو نەبوە گورج دەگەڕێنەوە لاشەکانیان و ئیتر لە ئـازارو هەسـتە فیزیکیـەکانی دی بەئاگادێتەوە .

مـن چـەند جـارێ نەخۆشـی ئـەزمون دیـدەی سـەرەمەرگم هـەبوەو لەهـەمووی سـەیرتر بازرگـانێکی خـەڵکی ئـەمریکای باشـور بـوو . نـاوی (جاکوب) بوو. دووساڵ دوای ئەوەی چارەسەرکردنی کـاترین تـەواو بـوو بـۆ چەن دانیشتنێکی چارەسـەری دەروونـی هاتـەلام . ئـەو لەسـاڵی ١٩٧٥ لـە هۆڵەندا وەختێ کە سی ساڵ تەمەنی بوو ، ماتۆڕێك خـۆی لێدابوو ئـەمیش بێهـۆش کـەوتبوو . لـەبیری بـوو کەبەسـەر لاشـەی خۆیـەوە هـەڵاژاو بـووەو

کەهاوپلەمانە بەڵام ئەمە هەڵەیە . پێویـستە بـەرەو لای کەسـێکیش کـە وەک ئێمە نیە بچیت تابتوانیت یارمەتیان بەیت )) .

(( هێزی دەرەکی بینین "شهود" ادەرکی هەستی ) بەئێمە بەخشراوە. دەبێ پەیڕەوی لێبکەین و لەبەردەمیا ملـەجیرە نەکـەین . ئەوانـەی ملـە جیرە دەکەن توشی مەترسی دەبنەوە لـە پلەیەکـدا ، دەرەقـەتی هێـزی بەرامبەرو وەک خۆشمان نایەین . هەندێکمان هێزەکانمـان پـترە لـەوانی دی ، چونکە ئەم هێزانە لەزەمەنە جیاوازەکانەوە چـنگکەوتوون . بـەهۆی ئەمەشـەوەیەخەڵکی وەک یـەک نـابن . بـەڵام دواجـار دەگەنـە شـوێنێ هەموان یەکسان دەبن )) .

کاترین بێدەنگ بوو . ئەمزانی ئەمە فیکری ئەو نەبوون . ئەو لەفیزیك و میتافیزیك ڕابردوویەکی نەبوو . وە دەربارەی پلـەکانی دوای مـردن و ـ هتـد ... هیـچی نـەدەزانی ، سـەرباری ئەمانـەش جـ 'نی وشـەو فیکـرو چـەمکی فەلسەفەی گوتەکانی هەموو لەودیو تواناکانیەوە بوو . ئەو قەت ئاوا پوخـت و شاعیرانە نەدوابوو . هەستم دەکرد هێزێکی باڵا دەیویست لـەڕێی زەیـن و ژێ دەنگیەکانیەوە ئەم فیکرانە بەم وشانە دەربڕێ تا شایانی تێگەیشتنیان بم. نا ئەمە کاترین نەبوو . قسەکانی دۆخی خەواڵوییان هەبوو :

(( کەسـانێ کەلـە بێهۆشـیدان ... بـەئاوێزانی دەمێننـەوەو هێـشتا ئامادەیی گوزەر لـەم پلـەوە بـۆ پلەیـەکی تریـان نیـە ... تائـەو سـاتەی کەبڕیار بدەن ئایا مـەیلی گواسـتنەوەیان هەیـە یـان نـە . تـەنیا خۆیـان ئەتوانن ئەم بڕیارە بـدەن . بـەم چەشـنە ئەگـەر هەسـت بکـەن لـەناو لاشەیاندا شتێ بۆ فێربوون نەماوە ئەوسـا مۆڵـەتی کۆچـیان پێـدەدرێ . بەڵام ئەگەر بڕیار بێ شتی زۆرتر فێر بن ، تەنانـەت ئەگـەر نەشـیانەوێ

بگەڕێنەوە هەر ناچارن بگەڕێنەوە . بۆ ئـەو کەسـانە بێهۆشـی قۆنـاغێکی پشوو دانە . قۆناغێکە زەین تیایدا دەتوانێ پشوو بدات » .

سەرباری ئەوەی ئەو کەسانەی لە بێهۆشیدان بەسەرنجدان لەوەی تـا چ ئەندازەیە ئەبێ فێربن لەلاشـەی خویـان دا ، دەتـوانن بڕیـاری گەڕانـەوەیات بدەن . ئەگەر هەستبکەن شتێکی ئەوتۆ نەماوە بۆ فێربون ، بەبێ لەبەرچاو گرتنی پزیشکی نویێ ئەتوانن ڕاستەوخۆ بـچنە پلـەی ڕۆح . ئـەم بابەتـە زۆر چاك هاوتایە لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی ( ئـەزمونی سـەرەمەرگ ) کراون و ئەمەی کـە بۆچـی هەنـدێ کـەس گەڕانـەوە هەڵدەبـژێرن . مۆڵـەتی تێپەڕین بەهەندێ کەسیتر نادرێ چونکە شتی زۆر ماوە فێری بن لەدونیادا . ئـەوەش بڵـێم هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە (ئەزمونـەکانی سـەرەمەرگ ) یـان بڵاوکراوەتەوە گەڕاونەتەوە لاشەکانیان . داستانەکانیشیان زۆری چونیەکە. ئـەوان لەلاشـەیان جـودا دەبنـەوەو دەڕوانـن لـەخۆیان . دواجـار نـورێکی درەخشان یا کەسێکی ڕۆحـانی لەمەودایـەکی دوور دەبیـنن ، بـەم چەشـنە هەست بەئازار ناکەن . بەڵام کاتێ زانییان فەرمانەکانیان لەسەر زەوی تەواو نەبوە گورج دەگەڕێنەوە لاشەکانیان و ئیتر لە ئـازارو هەسـتە فیزیکیـەکانی دی بەئاگادێتەوە .

مـن چـەند جـارێ نەخۆشـی ئـەزمون دیـدەی سـەرەمەرگم هـەبوەو لەهـەمووی سـەیرتر بازرگـانێکی خـەڵکی ئـەمریکای باشـور بـوو . نـاوی (جاکوب) بوو. دووساڵ دوای ئەوەی چارەسەرکردنی کـاترین تـەواو بـوو بـۆ چەن دانیـشتنێکی چارەسـەری دەروونـی هاتـەلام . ئـەو لەسـاڵی ۱۹۷۵ لـە مۆڵەندا وەختێ کە سی ساڵ تەمەنی بوو ، ماتۆڕێـك خـۆی لێـدابوو ئـەمیش بێهـۆش کـەوتبوو . لـەبیری بـوو کەبەسـەر لاشـەی خۆیـەوە هـەڵاژاو بـووەو

سـەیری دیمـەنی پێکدادانەکـەی خۆیـانی کـردووە . ئـەو تەماشـای ئـامبولانس(ئۆتـۆمبێلی فریاکـەوتن) و ئـەو پزشـکەی کـە برینـەکانی تیمـار کـردوەو ئەوانەشـی کـە لـە دەوری بـوون ، کـردوون . لـەدوور دەسـتەوە ئاگاداری ڕوناکیەکی ئالتونی دەبیٚ و وەختیٚ لیٚی نزیك دەبنەوە ڕاهیبێك دەبینیٚ جلی قاوەی لەبەردایە . ڕاهیب بە جاکوب دەڵیٚ کەهێشتا وەختی مردنی نـەهاتوەو پێویستە بگەڕێتـەوە بـۆ لاشـەکەی . ژاکـوب عـەقڵ و ئەندێشەی ڕاهیب کە چەند ڕوداوێکی دواتری ژیانی ڕاست دەرچوون و ئـەم پـشکوێی خـستبون هەسـت پـیٚ دەکـات . پاشـان بـۆ لاشـەکەی کەلەسـەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە بوو دەگەڕێتەوەو ئیتر هۆشـی دێتـەوەو بۆ یەکـەم جار دوای پێکدادانەکە هەست بە ئازارێکی زۆر دەکات .

جاکوب یەهودییەکەو وەختیٚ لەگەشت و گوزارە لە ئیسرائیل، دەچێت بۆ دیتنی ئەشکەوتی ( پات ڕیارکز ) ئەم ئەشکەوتە هەم لای یەهودییەکان و هەم لای موسڵمانەکان پیرۆزە . پـاش ئـەو کارەساتەی لـە هۆڵەنـد زیـاتر مەزهـەبی بووبـوو وە زیـاتریش دوعـای دەکـردو ڕیٚ و ڕەسمـی مەزهـەبی جێبـەجیٚ دەکـرد . لەمزگـەوتیٚ کەلەهـەمان شـوێندا هـەبوو لەگـەڵ موسـڵمانەکاندا بـەدوعاو نزاکردنـەوە دانیـشت . دواتـر هەسـتابوو تـا بـڕوا . پیرەمێردێکی موسڵمان لیٚی نزیك دەبێتەوەو دەڵیٚ : (( تۆ جیاوازی لـە چـاو ئەوانی کەتاندا ، ئەوان لەگەڵ ئێمە بۆ نزاکردن دانانیشن . )) پیرە مێردەکە هەڵوێستەیەکی کـردوو بـەر لـەوەی بـەردەوامبێت لەقسەکانی بـە ووردی سەیری ژاکوبی کردو وتی :

(( تۆ ڕاهیبت دیووە . ئەوەی ئەو پێی گوتوی لە بیری نەکەیت ! ))

پێنج ساڵ دوای ئەوپێکدادانەو هەزاران میل دورتر پیرەمێردێ لە مواجەهە کردنی جاکوب لەگەڵ ڕاهیب ئاگادار بوو .

ئەو کاتەی لە عیادەکەم بیرم لەو شتانە دەکردەوە کە کاترین لەم دواییانەدا دەری خستبوون ، ئەگەر دانەرانی دەستورە بنەڕەتیەکان بیانزانیبا مرۆڤەکان بەیەکسانی درووست نەبوون چیان دەکرد . خەڵکە بەتواناو لێهاتووەکان هێزو بەهرەکانیان لە ژیانی ڕابردوویانەوە بۆیان فەراهەم بووەو لەدایك دەبن . « بەڵام دواجار دەگەینە جێیە هەمووان یەکسان دەبن . » من گومانم دەبرد کەئەو پلەیە پاش لەدایکبوون و ژیانێکی زۆر دەبێ .

دەربارەی ( مۆزارت )ی لاو و توانا بێ ئەندازەکانی زەمەنی منالی بیرم دەکردەوە . ئایا ئەمەش هەر ڕاگواستنی تواناکانی پێشتربووە ؟ بەم پێیە ئێمە تواناکانمان و قەرزەکانمان بۆ ژیانێکی نوێ دەگوازینەوە .

هەروەها بیریشم لەمەڕ ئەو مەسەلە کردەوە کە چۆن چۆنی خەڵکی مەیلیانە لەگروپ و پێرەکانی خۆیان خڕبنەوەو لە غەیری خۆیان دوورکەونەوە یان لێشیان بترسن . ڕیشەی زۆرێ لەخۆپەرستی و نەفرینەکان هەر لەم مەسەلە دایە . « ئەبێ فێر بین تەنها بە ڕووی کەسانێ کەیەك ڕەوتین نەچین . » لە پێناو ئەوەی یارمەتی خەڵکی تر بدەین . دەمتوانی هەستی مەعنەوی لە وتەکانیا دەستنیشان بکەم .

کاترین بەردەوام بوو : « من پێویستە بگەڕێمەوە ، پێویستە بگەڕێمەوە. » بەڵام من ئەمویست زۆرتر ببیستم . لێمپرسی : ( ڕابرت جارود کێیە ؟ ) کاترین لە دوا دیدارمانا ناوی ئەوی هێنا بوو کە پێویستی بەیارمەتی من هەیە .

« نازانم ... ڕەنگە ئەو لەپلەیەکی تردابێ ، لێرە نیە .» وادیار بوو نەیەتوانی ئەو بدۆزێتەوە . وتی «تەنها کاتێ بیەوێ و خۆی بڕیاربدات بێتە لام پەیامم بۆ دەنێرێ . ئەو پێویستی بەتۆ هەیە » .

هێشتا نەمئەزانی چۆنچۆنی ئەتوانم یارمەتی بدەم .

کاترین هاتە وەلام: «من نازانم ، ئەوە تۆی کە دەبێ بیزانیت نەک من . »

سەیر بوو . ئایا ئەم شتانە بۆ من بوو ؟ وەیان ئەوەی لەڕێگەی فێربونەوە ئەتوانم یارمەتی (ڕابرت جارود بدەم) ؟ ئیتر هیچم دەربارەی ئەو نەبیست .

کاترین دووبارەی کردەوە : « من ئەبێ بگەڕێمەوە . سەرەتا ئەبێ بچم بەرەو ڕووی ڕوناکیەکە » لەپڕا هەراسان بوو . «ئۆوەی .. ئۆوەی ... زۆر دوا کەوتوم ... چونکە دواکەوتوم ئەبێ ئارام بگرم . » چاوەڕوان بوو. لێمپرسی چی دەبینی و چ هەستیکت هەیە؟

«هەر ڕۆحەکانی تر دەبینم ، ئەوانیش چاوەڕوانن . » لێمپرسی ئەو وەختەی لەچاوەڕوانیدا بووی شتێك هەبوو تا ئێمە فێری بین. پرسیم :((دەتوانی بلێی کە دەبێ فێری چ شتێ ببین ؟ ))

وەلامی داوە : « ئەوان لێرە نین تا پێم بلێن . » سەیر بوو . وەختێ ڕۆحە مەزنەکان نەبون کاترین نەیدەتوانی زانیارییەکی دەستکەوێ .

« من لێرە زۆر بێقەرارم . ئەمەوێ بڕۆم ... وەختێ زەمەنی گونجاو هەبێت ئەڕۆم . » دووبارە چەند ساتێ بەبێدەنگی تێپەڕی . سەرەنجام دۆخەکە ڕەخساو ئەو چووە قۆناغێکی تر لە ژیانی .

« من درەختە سێوەکان ... و خانویەک ، خانویەکی سپی ئەبینم . من لەم خانوەدا دەژیم . سێوەکان گەنیون ... ڕمزو بۆستانەکان بـۆ خـواردن ناشێن . جۆلانەیەک هەیە . جۆلانەیـە بەدرەختـەوە بەسـتراوە . » داوام لێکرد سەیری خۆی بکات .

« قژم کاڵە ، پێنج ساڵم ، ناوم کاترینە . » سەرسام بـوم . ئـەو هـاتبوە ناو ژیـانی ئێستەیەوە . کـاترین لەتەمـەنی پێـنج سـاڵیدا بـوو بـەڵام ئەشـێ هەبونی لێرەدا هۆیەکی هەبێ . ((کاترین ! چی ڕویداوە ؟ ))

«باوکم تورەیە لەدەستمان ... لەبەر ئەوەی نابێ لەدەرەوە بین . ئەو ... بـەدارێک لـێم ئـەدات . دارەکـە زۆر قورسـە . ژان دێنـێ ... مـن ئەترسم. » ئەیناڵاندوو وەکو مناڵ قسەی ئـەکرد . «ئـا شـتێکمان لێنـەکات دەست لە لێدانمان هەڵناگرێت . بۆچی ئاوایە لەگەڵمان ؟ بۆچی ئەوەندە تورەیە ؟ » داوام لێکرد لەڕوانگـەیـەکی بـەرزترەوە تەماشـای ژیـانی بکـات و وەڵامی پرسیارەکەی خۆی بداتەوە . لەبارەی کەسـانێکەوە کـە ئـەیانتوانی ئەم کارە بکەن بابەتم خوێندبۆوە . هەندێ لەنوسەران ئەم پلەیە بە (خودی گەورەتر ) یا ( خودی باشتر ) ناو زەند ئەکەن . ئەمویست بزانم ئەگەر وەها حاڵەتێ هەبووە کاترین ئەیتوانی دەسـتی پێبگـات یـان نـە . ئەگـەر وابوایـە ئەم ڕەوشە ئەیتوانی تـەکنیکێکی بـەهێزی چارەسـەرکردنی نەخۆشـی بـێ . ڕێگەیەکە لە نێوان بینین و ئاگایی .

بـەئارامی لـەژێر لێـوەوە وتـی : « ئـەو هـەرگیز ئێمـەی نەویـستوە ، وائەزانێ ئێمە بەزۆر پێمان ناوەتە ناو ژیانیەوە ... ئێمەی ناوێ » .

پرسیم: (( براکەشتی ناوێ )) .

«بەڵێ براكەم زياتر . ئەوان بـۆ بـونی براكـەم هـیچ بەرنامەیـەكیان نەبووە . وەختێ ئاوڵەمە " جەنین " ەكەی دروستدەبوو ... ژن و مێردی یەكتر نەبوون . » ئەم مەسەلە بۆ كاترین دڵتەزێن بوو . دەربـارەی حاميلـە بوونی دایكی بەر لەشووكردنی هیچی نەئـەزانی . دواتـر دایكی ڕاسـتی ئـەم قسەی كاترینی سەلماند .

ئەگەر چی ئەو دۆخی ژیانێكی دەگێڕاوە بەڵام زانیاری و ڕای دەربـارەی ژیانی ئێستەشی دەگووت كە پێشتر نەستەم بـوو. وەهـا دەدوا كـە زەینـی ژانرێكـی (بـاڵاتری ) هـەبوو وەزانیاریـەكی بـەرزتر . ڕەنگـە ئەمـە هـەمان "خـودی بـاڵاتر"بـیٚ كەباسـكرابوو . هەرچـەندە لەگـەڵ ڕۆحـە مەزنـەكان و زانستە بێسنورەكانیادا لەپەیوەندیدا نەبوو بەڵام ئەم حاڵەتە دیدێكی قوڵترو زانیارییـەكی زۆرتـری هـەبوو . وەكـو دروسـت بـوونی ئاوڵەمـەی براكـەی . كـاترینی ئا، ایی وەختـیٚ بێـداربوو زۆر نیگـەران و چـەق بەسـتوو ؛ ›ە زۆر سادەو ڕووكەشی بوو كەنەی ئەتوانی ئەم حاڵەتەی چنگكەویٚ . نـازانم ئایـا پێـشەوایانی مەزهەبـەكانی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا ، ئـەیانتوانی لـەپێناو بەدەستهێنانی زانـست و زانیـاریەو دەرككردنـی پـەروەردگاریان سـود لـەم ((ئاگاییە باشترە )) وەرگرن ؟ گەروابیٚ ئایا هـەمووماں توانـای ئەنجامـدانی ئەم كارەمان هەیە ؟ چونكە ئەبیٚ هەموومان خاوەنی ئەم ئاگاییە باڵابین . (كارول یونگ ) لە پلە جیاكانی ئاگایی مرۆڤ بەخەبەر بـوو . ئـەو دەربـارەی (ئاگایی گشتی) بابەتێكی نوسیووە . دۆخێك كە هاوشێوەی دۆخـی ئاگـایی كاترینە .

سەرسام بووم بەو هێزو گەورەییەی هەستی كـاترین كەلـە بێداری و لـە خەوانـدنا هـەیبوو ، لـەكاتی هیپنۆتیزمـا لەئاگاییـەكانا بـوو ، وتووێـژی

فەلسەفی سەرنجڕاکێشم کەگەڵیا هەبوو . بەلاَم وەختێ بێدار بوو هیچ هۆگرییەکی بەفەلسەفەو ئەو باسانەوە نەبوو . ئەو بەبێ ئەوەی بزانێ لەناخیا چ زانستێ هەیە نوقمی جوزئیاتەکانی ژیانی ڕۆژانەی ئەبوو .

باوکی ئەوی ئازار ئەداو نهێنیەکەشی لەهەڵدانەوا بوو . بەتۆنێکی پرسیار ئاساوە وتم : (( پێویستە وانە گەلێك فێرببێ ؟ ))

«بەڵێ هەر وایە »

لێمپرسی ئەزانی باوکت دەبێ فێری چ شتێ ببێ . بەدەنگێ کە دەتگوت لەدوور دەستەوە وتی :

« ئەم زانستە لەدەست منا نیە ، شتێك بۆمن دەرئەکەوێ کەبەلامەوە گرنگ بێ . شتێ کەپەیوەندی بەمنەوە هەبێ. هەر کەسە دەبێ لە بیری خۆیدا بێ ... پیویستە بزانێ چۆن چۆنی ئەتوانێ خۆی ... کامڵ بکات . پێ ستە لەسەرمان فێری زۆر وانە ببین ... یەکـ بەیەکەمان ، ئەبێ ئەم وانانە یەکە یەکە ... بەدوای یەکا بخوێنرێن . پاشان ئەتوانین بزانین خەڵکانی تر پێویستیان بە چ فێرکاریە هەیەو لەپێناو کەماڵ بونی ئەوان و خۆمان لە چ شتێکمان کەمە »

کاترین لەبەر خۆیەوەو زۆر بەناسکی و پڕ لە عیشق ئەدوا .

وەختێ دووبارە هاتەوە قسە بەدەنگی قۆناغی منالی بوو .

«خەریکە حالْم ئەشێوێنێ . زۆرم لێئەکات شتێ بخۆم کەئیشتیهاو حەزم لێی نییە. جۆرێ خواردنە ... کاهو پیازو شتی تریش کە جارسم دەکەن . زۆرم لێئەکات بیانخۆم و ئەشزانێ گەر بیخۆم هەڵی ئەهێنمەوە. دەربەست نایە !»

کاترین هێڵنجی ئەداو هەناسە بڕکێی بوو . دووبارە داوام لێکرد لە ڕوانگەیەکی بەرزەوە سەیری دیمەنەکە بکات تابزانێ بۆچی ڕەفتاری باوکی ئاوەهایە .

کاترین بەنەجوایەکی خەشمەوە وتی : ((پێئەچێ ئەم ڕەفتارە فەراغێ لەدەرونیا پڕکاتەوە . ئەو بەهۆی کارێ کە کردویەتی لەمن و لەخۆشی جاڕسە . (ئەو هێرشەی باوکی کردبویە سەری لە سێ ساڵیدا لەبیرم کردبوو) ئەیەوێ من تەمێ بکات ... من ئەشێ هۆکاری ئەوکارەی باوکم بوو بێتم.)) ئەو کات کاترین سێ ساڵان بووەو باوکی مەست . ئیتر لەو وەختەوە ئەمەی لەدڵدا هەڵگرتوە . ئەمەم پێگووت .

((تۆ زۆر منالْ بووی . ئێستە بزانە کەخەتای تۆ نەبووە . تۆ کاری خراپت نەکردوە ، منالێکی سێ ساڵە ئەتوانێ چ تاوانێ بکا . گوناهی تۆ نەبووە ، هی باوکت بووە )) .

بە ئارامی وتی : (( ئەو کاتەش لێم بێزار بووە . من ئەو لەزووترەوە ئەناسم بەڵام ناتوانم دەستم بەو زانیاریانە بگات. پێویستە بگەڕێمەوە بۆ ئەو زەمەنە . )) هەرچەندە چەندین کازێر تێپەڕیبوو بەلام من ئەمویست بگەڕێینەوە بۆ پەیوەندی کۆن و پێشتریان بۆ ئەمەش دەستورێکی دوورو درێژم پێدا .

((تۆ لەقوڵای دۆخێکدای . لەدوای ساتێ و لەسێ تا یەك دەژمێرم ئەچێتە بارێکی قوڵترو هەست بە ئاسودەیی ئەکەیت . زەینت ڕەها دەبێ تابتوانێ بۆ زەمەنە کۆنەکانی تر بچێ . بۆ سەرەتای ئەو زەمەنەی کە پەیوەندی لەگەڵ باوکت دەست پێدەکات . بۆ زەمەنێکی گرنگ تر کە پەیوەندی هەیە بەوەی لە منالێدا ڕوویداوە . کاتێ ئەڵێم (یەك ) دەچێتە

ئەو قۆناغەو ئیتر بەبیرت دێتەوە . تۆ ئەتوانی ئەم کارە بکەیت ... سێ ... دوو ... یەك . )) وەستانێکی زۆر .

((ئەو نابینم ... ئەوەندە ئەزانم خەڵکی ئەکوژرێن ! )) دەنگی بەرزو خەشم بووەوە . ((ئێمە مافی ئەوەمان نیە ژیانی خەڵکی بەر لەوەی کارمایەکانیان دابێتەوە کتوپڕ ڕاگرین کەچی وائەکەین . هەرگیز مافی ئەوەمان نیە .ئەگەر بیەڵین بژین بەرگەی سزای زۆرتر دەگرن . وەختێ ئەمرن و ئەچنە ڕەهەندێکی ترەوە لەوێ ئازار ئەدرێن و لە نائارامیەکی زۆردان . ئاسوودە نابن و ئەگەڕێنەوە بۆ دونیا بەڵام ئەمجارە ژیانیان زۆر دژوار ئەبێ و ناچارن ئەو ستەم و نادادپەروەریانەی کەبەرامبەر خەڵکی بەڕەوایان زانیوە قەرەبوو بکەنەوە . ئەم خەڵکە کەژیانیان لێ ئەسەنن مافی ئەمەیان نیە . تەنها پەروەردگار ئەتوانێ تۆڵەیان لێبکاتەوە نەك ئێمە . تۆڵەشیان لێ ئەکرێتەوە )) .

خولەکێ بەبێدەنگی تێپەڕی . کاترین وتی : (( ئەوان ڕۆشتن )) ئیمڕۆ ڕۆحە مورشیدەکان پەیامێکی تریان بۆ ئێمە پێبوو . پەیامی ڕاشکاوانە . لەهەر دۆخ و بارێکدا نابێ کەس بکوژین . تەنها پەروەردگار ئەتوانێ سزایان بدات .

کاترین زۆر ماندوو بوو . بڕیارمدا ناکۆکی پەیوەندی لەگەڵ باوکی گرێبەم بەکاتێکی ترەوە . بێدارم کردەوە . شتێك جگە لە ژیانەکانی بە ناوی کریستین و کاترینی لاو بە بیر نەهات . ماندوو بەڵام ئارام بوو. دەتوت بارێکی گەورە لەسەر شانی هەڵگیراوە . چاوم بە چاوی کارول کەوت ئێمەش ماندوو بووین . لەساتی لێدوانەکانی کاتریندا عارەقمان کردبوو . هەردوو لە ئەزموونی موعجیزەئاسادا بەشدار بووبووین .

دانیشتی هەفتانەی هیپنۆتیزمی کاترین چەند کارێزێکی ئەخایاند . منیش وارێکم ئەخست ئەو دواین نەخۆشم بێت . هەفتەی دواتر کە هاتە ژوور هێشتا ئەو ئارامیەی پێشوو لە ڕوخسار دیار بوو . بەتەلەفۆن لەگەڵ باوکی قسەی کردبوو بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ گەردنی ئازاد کردبوو. هەرگیز کاترینم بەو چەشنە نەدیبوو . زۆر خۆشحاڵبووم لەوەی وابەزوویی چاکبووبوو . دەگمەن بوو ئاوەها نەخۆشیە بەو ترس و دڵەڕاوکە قوڵەوە بەم زووییە چاك بێ . هەڵبەت کاترین نەخۆشێکی ئاسایی نەبوو چونکە چۆنیەتی چارەسەرکردنی وابەستە بە خەڵکەوە بوو .

بەخێرایی چووە خەواندنەوە : «بووکە شوشەیەکی چینی ئەبینم لەسەر تاقێك دانراوە . کتێب لەملاولای شومینەکەوەیە . ئێرە ژورێکی ناو ماڵەکەیە . گوڵە شەمدانیەکی زۆر لای بوکە شوشەکەدا هەن و تابلۆیەکیش ... دەم و چاو ، دەم و چاوی پیاوە، خۆیەتی ... » سەیری ژورەکەی ئەکرد . لێمپرسی چی ئەبینی ؟

« فەرشێ لەناوەڕاستی ژوورەکەدایە . لێوارەکانی پزوە. وەکو شتێ ... پێستی ئاژەڵە ، بەڵێ ... پێستی ئاژەڵ . دراوە بەژورەکەدا . لای ڕاستەوە دوو دەرگا هەیە ... بەسەر هەیوانەکەدا دەکرێتەوە . چوار پلیکانە هەیە . پایەکان لەبەردەم خانوەکەدا . چوار پلیکانە بەرەو خوارە . لەملاولاوە دارو درەخت هەن ... کۆمەڵێ ئەسپ لە دەرەوەن . زینەکانیان بەو ستونانەی لە دەرەوەن ... بەسراون » .

پرسیم : ((ئەزانی ئێرە کوێیە ؟ )) کاترین هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا.

((ناو نابینم بەڵام ساڵ ، قەرنی هەژدەیە . بەڵام مـن ... درەخـت و گوڵــە زەردە جوانــەکان ... )) گوڵـەکان سـەرنجی ڕاکێـشابوون . ((بۆنیـان زۆرخۆشە. بۆنیان دڵگیرن ، گوڵەکان ... گوڵی سەیر سەیر ، گوڵی گەورە ... گوڵی زەردی ناوڕەش ))

وەستاو لەناو گوڵەکاندا مایەوە . کەوتمە بیری کێڵگەی گوڵە بەڕۆژەکان لـە باشوری فەرەنسا . پرسیاری ئاوو هەوام لێکرد .

((زۆر خۆشە هەرچەندە شەماڵی نییە . هەوا نەگەرمەو نەساردە )) لـە ناسـینەوەی شـوێنەکەدا هـیچ پێـشکەوتنێکمان نـەکرد . لەگوڵــە زەردە جوانـەکان دوورم خـستەوەو بردمـەوە بـۆ ماڵـەوە . لێمپرسـی وێنـەی کـێ بەسەر تاقەکەوەیە .

((نازانم ... بەردەوام (ئارون) ئەبیـ ـم ... ناوی ئارونە . ))

لێمپرسی : (خانوەکە ماڵی ئاروونە ؟ )

((نا خانوەکە ماڵی کوڕەکەیەتی . من لەوێ کار ئەکەم .)) جـارێکی دی بووبووەوە بە خزمەتکار . ئەو ژیانانەی لێی کۆڵابوینـەوە هـەرگیز کەسێکی وەکو (کیلـۆ بـاترا ) یـان (نـاپلوێن ) نـەبووبوون . ئەوانـەی بـەگومان بـوون لەچوونەوەی ڕۆح بۆ لاشە ، وایان ئەزانی ئەمە تەنها بۆ کەسـانی بەناوبانگ ڕوونـەدات . هەنوکـە خـۆمم لـە دۆخێکـی نائاسـایدا ئـەبینی . گەڕانـەوەی دووبـارەی ڕۆح بـۆ لاشـە بەشـێوەیەکی زانـستی و ڕێـك و ڕەوان لێرەداولـە بەشی دەروونـی لەبـەر چـاوەکانما دەسـلەمان . جگـە لەمانـەش زۆر باسـی تریش دەکراو دەچوون .

کاترین بەردەوام بوو : «پێم زۆر ... زۆر ... قورسە . ئێشێ . وەك ئەوە وایە نەمبێت ... پێم زیانی پێگەیوە . ئەسپەکان جووتەیان لێداووم » پێمگوت سەیری خۆی بکات .

«قژم قاوەی و لوولە . کلاوێکم لەسەرایە . کلاوێکی سپی . جلێکی شینی وەکو پێشبەندم لەبەردایە ... پێش بەند. گەنجم و منالْ نیم . پێم ئێشێ . هەر ئێستە ئازاری پەیاکرد . زۆر ئێشێ . » وادیار بوو ئازاری زۆر بوو . «نالْ ...نالْ ، ئەو ئەسپە بەنالەکەی لێی دام . ئەسپێکی تا بلێ ی تورەیە.»

کەئازاری کەم دەبۆوە دەنگیشی ئارامتر ئەبوو.

«ئەتوانم هەست بەبۆنی ئالیك بکەم . ئالیکی ناو تەویلە ... چەند کەسێکیتر لەملاولای تەویلەکەوە ئیش ئەکەن .»

پرسیارم لێکرد د ەربارەی فەرمانەکەی .

«من بەرپرسی خزمەتکردن ... خزمەتکردن لە خانویەکی گەورە بووم . دۆشینی گامێشەکانیش لە ئەستۆی من بوو . »

ئەمویست دەربارەی خاوەن مولْکەکانی ئەوێ شت بزانم .

«خاتوونی مالْ کەمێ قەڵەوە بەلأم جل و بەرگی خراپە. دوو کچیش هەن ... ئەوان ناناسم .» چونکە پرسیاری منی پێشبینی کردبوو کە ئایا ئەو کچانە لە ئێستادا ئەناسی ئەوەشی بۆ زیادکرد . پرسیارم دەربارەی خێزانی خۆیان لەسەدەی هەژدەهەم لێکرد .

«نازانم ، ئەوان نابینم . کەس لەگەڵ خۆم نابینم . »

پرسیم ئایا لەکوێ ئەژی ؟

«بەڵێ لێرە ئەژیم بەڵام نەک لەخانووە سەرەکییەکەدا . خانویەکمان بۆ کراوە زۆر بچوك ... مریشکمان هەیە . ئێمە هێلکەکانیان کۆئەکەینەوە . هێکلەی قاوەیی . خانوەکەم زۆر بچوکە ... سپیە ... ژوورێکی تیایە . پیاوێ ئەبینم . لەگەڵیا ئەژیم . قژی لول و چاوی شینە .»

پرسیم شوی کردوە یان نا .

« ئەو تەسەورەی ئەوان بۆ هاوسەرگیری هەیانە نا .» ئایا لەوێ لەدایکبووی ؟

«نەخێر ، کاتێ زۆر منالّ بووم منیان بۆ ئێرە هێناوە . خێزانەکامان زۆر هەژار بوون » وادیار بوو ئەو پیاوەی لەگەڵیا بووە نەیدەناسی. ڕێنومایم کرد زەمەن تێپەڕێنێ تا ئەگات بە ڕووداوێکی گرنگی دواتر لەژیانیدا .

«شتێکی سپی ئەبینم .. سپی بەڕشتەی دوراو لەدەوری . ئەشێ کلاو بێ . جۆرە کلاوێ بە پەڕو ڕشتەی سپی »

((کێ کلاوی لەسەرایە ؟ ئایا ... )) قسەکەمی بڕی .

«دیارە کەخاتوونی مالّ .» هەستم بەدەنگی کرد .

«زەماوەندی یەکێ لەژنەکانیانە . خەڵکی هەموو ئەو ناوە لەو زەماوەندا بەشداریان کردووە . » پرسیم لەڕۆژنامەدا هیچ شتێ دەربارەی ئەو زەماوەندە نوسراوە یان نا . خۆ ئەگەر نوسراوە سەیری بەروارەکەی بکە .

« نا ، وانازانم لەوێ ڕۆژنامە هەبێت . شتێکی وەکو ڕۆژنامە نابینم .»

لەو قۆناغەدا هیچ شتێ وەکو بەڵگە وەرنەدەگیرا .

پرسیم : (( ئایا خۆشت بەشداری لەو زەماوەندەیا ؟ ))

«ئێمە بەشدارنین لەو زەماوەندا ، تەنها ئەتوانین هاتووچۆی خەڵکی ببینین . خزمەتکارەکان بۆیان نیە لەو بۆنانەدا بەشداربن » .

((هەست بەچی ئەکەیت ؟ ))

«انەفرەت »

((بۆچی لەگەڵت خراپن ؟ ))

بەئارامی وتی : « لەبەرئەوەی هەژارین و وابەستەی ئەوانین ، وەلەچاو ئەواندا هیچمان نیە » .

ئایا ئەتوانی واز لەوێ بهێنی یاخود هەموو ژیانت لەوێ ئەبەیتە سەر؟))

بەنائارامی وەڵامیداوە : « هەموو تەمەنم لەوێ ئەبەمە سەر .» هەستم بە پەژارەی دەکرد . ژیانی هەرناسۆریو دژواری بوو . بردمە رۆژی مردنی .

«ماڵێ ئەبینم . لەسەر قەرەوێڵەیە لەجێگاکەوتووم . شتێکم ئەدەنێ بۆ خواردنەوە ، شتێکی گەرمەو بۆنی نەعنای لێ دێ . سنگم ئورسە . هەناسەدان دژوارە ... سنگم و پشتم ئێشێ ... ژانێکی توندە ... قسەکردنیش دژوارە . »

ئازارێکی بەهێزی هەبوو ، هەناسەی کورت و توند بوو . پاش چەند خولەکێ ئازار دەم و چاوی ئارام بوەوە . لاشەی دەحەویەوە . هەناسەدانیشی هاتەوە باری ئاسایی خۆی .

دەنگی بەرزترو تورەتر بوو : «لەلاشەم دەرچووم . رووناکیەکی زۆر جوان دەبینم ... خەڵکێک بەرەو لام دێن . دێن تا یارمەتیم بەن . کەسانێکی زۆر باشن . ئەوان ناترسن ... هەست بە سوکبوونێکی زۆر ئەکەم ... » وەستانێکی زۆر .

((رات چیە دەربارەی ئەم ژیانەی کە ئێستە تەواو بووە ؟ ))

« جارێ ئەمە پەیوەندی بەزەمەنێکی ترەوە هەیە . جارێ لەئارامیدام ، ساتی حەوانەوەیە . پێویستە ئاسودە بین . ڕۆح ... ڕۆح لێرە ئاسودەیی چنگ دێنێ . رۆحی مرۆڤەکان لێرەدا لە ئـارامی و حەوانەوەدایـە . مـرۆڤ گشت ئازاری لاشەکان وەلائەنێ . هەستێکی زۆر خۆشـە ... زۆر خـۆش . وەک ئـەوە وایـە لەسـەرمادا هـەتاو هەمیـشە لێتبـدات . ڕوناکییـەکی درەوشاوەیە . هەموو شـتێ لەڕووناکییـەوە دروسـت دەبـێ ! هێـز لـەم ڕووناکییـەوە دێ. ڕۆحـەکانمان یەکـسەر ئەچـێتە ئـەوێ . وەکـو هێـزی موگناتیس ئێمە بەرەو لای خۆی بـەکێش ئـەکات. زۆر ناوازەیـە . وەکـو سەرچاوەیەکی هێزە . باش ئەزانێ چۆن تیمارت بکات » .

((ڕەنگی چۆنە ؟ ))

کەمێ وەستا ، دیاربوو لەو ڕووناکیـەدا پـشوو ئـەدات . پاشـان وتـی : «ڕەنگاو ڕەنگە " .

پرسیم : (( ئەزمونی چ شتێ ئەکەیت ؟ ))

«هـیچ ... بەتـەنها ئـارامی . لێـرە لـەناو هاوڕێکانـت دای . هـەموو دۆستەکانت لێرەن . زۆر کەس ئەبینم . هەندێکیان نامۆ نـین و هەنـدێ نامۆن . ئێمە لەوێین و چاوەڕوانین . » ئەو هێشتا چـاوەڕوان بـوو . بڕیـارم دا دەست و برد بکەم .

((ئەمەوێ پرسیارێ بکەم ))

کاترین وتی : « لەکێ ؟ »

((لەهەرکێ بێ ، تۆ یـان ڕۆحـە مەزنـەکان . لام وایـە زانینـی ئـەم شـتە یارمەتیمان بدات . پرسیارەکەشم ئەمەیە ئایا زەمەن و شـوێنی هاتـە دنیـاو مردنمان خۆمان دیاریئەکەین ؟ ئایا ئەتوانین شوێنگای خۆمان هەڵبـژێرین ؟

ـ ەتوانین زەمەنی گەڕانەوەمان دیاریبکەین ؟ پێموایە زانینی ئەمانە زۆرێك لە ترسەکانمان وەدەردەنێ . ئایا کەس لات هەیە وەلامی ئەمانە بداتەوە ؟))

ژوورەکە سارد بوو بوەوە . کاترین دووبارە هاتە دووان بەلام دەنگی نزمترو لەبارتر بوو ، دەنگێکی وا کەپێشتر نەمبیستبوو . دەنگی شاعیرێ بوو.

((بەڵێ ئێمە خۆمان دیاری ئەکەین کەی بچینە ناو لاشەو کەیش دەرچین . ئەزانین کەچ کاتێ ئەو کارەی بۆی هاتویت تەواومان کردووە . ئەزانین کەی وادەمان تەواو بووە . ئیتر مرۆڤ پێشوازی مەرگی لێئەکرێ چونکە ئەزانێ ئیتر لەو قۆناغەی ژیانیدا هیچیتر بەنسیبی نابێ . پاش پشوودان و هێز بەخشینەوە بە ڕۆحتان ، مۆڵەتتان دەدرێتێ تا دووبارە بگەڕێیتەوە ناو لاشە . ئەوانەی دوودڵی بکەن و لەهاتنەوەیان دڵنیا نەبن پێئەچێ ئەو هەلەی پێیان دراوە لەدەستی بەن . هەێك کەتیایدا ئەتوانین یەکێ لەو کارانەی کە پێویستە لە قالبی فیزیکیدا ئەنجامی بدەن بەتەواوی بەئەنجام بگەیەنن)) .

بەدڵنیایی زانیم ئەوەی کەدەدوا کاترین نەبوو . بەتکاوە وتم : ((کێ لەگەڵما دەدوێ ؟ ))

کاترین بەنەرمی وەلامیدایەوە : ((نازانم . دەنگی ئەو کەسە زۆر ... ئەو کارەکان کۆنترۆڵ ئەکات بەلام نازانم کێیە . بەتەنها دەتوانم دەنگی ببیستم و هەوڵ بەم ئەوەی کەئەیڵێ بەتۆی بڵێم)) .

کاترین خۆشی ئەیزانی ئەم زانستە هی هەست و نەستیشی نییە . تەنانەت لە (بالاتر لەخۆ)شی نەبوو . ئەو گوێی لە کەسێ کە کارەکانی لەدەستابوو ئەگرت و وشەو فیکرەکانی دەووتەوە . بەم چەشنە ڕۆحێکی

دی هاتبوو . ڕۆحێ لەگەڵ ڕۆحەکانی دی کەپێشتر پەیامی ئەقڵی ناردبوو جیاواز بوو . ئەم ڕۆحە مەزنە ڕۆحێکی نوێ بوو ، بەدەنگی شاعیرانەو ئارام بەخش بەبێ هیچ گومانێك لە مردن ئەدوا. کەچی دەنگ و فیکری لێوان لێوبوون لە عەشق . عەشقێ کە بوون و گەرمیەکەی هەست پێدەکرا . عیشقی جیهانی و بێکەس . عیشقێ کەلەسەرو ئەفراندنەوە بوو . بەلاّم دووبارەو سنوردارو لەڕووی ئیحساساتیشەوە نەبوو .

کاترین هاتەوە دووان : « من باوەڕم بەم کەسە نیە » .

پرسیم : ((باوەڕت بەکێ نییە ؟))

« بەڕۆحە مەزنەکان » .

(( باوەڕت پێنییە ؟ ))

« نەخێر باوەڕم نییە . بەهۆی ئەمەشەوەیە ژیانم دژوار بووە . من لە قۆناغەی ژیانما بێباوەڕ بووم . » کاترین ژیانی ن ›دەی هەژدەی تاووتوێ ئەکرد . لێمپرسی لەو ژیانەیدا فێری چی بووە .

« فێری تورەی و نەفرین بووم . وە زانیشم کە ژیانی خۆمم پێکۆنترۆڵ ناکرێ . من هەیمەنەم ئەویست بەلاّم نەبوو . دەبوایە باوەڕم بەڕۆحە مەزنەکان هەبووایە . ئەوان ڕێنوماییان دەکردم . بەلاّم باوەڕم پێیان نەبوو . هەستم ئەکرد هەر لەسەرەتاوە نەفرەت لێکراو بووم . هەرگیز بەچاوی باش سەیری ئەوانم نەکردووە . ئەبوو باوەڕمان بووایە ... ئەبوو باوەڕمان بوایە ، وەمن گومانم هەبوو ، لەبری یەقین گومانم هەڵبژارد » کاترین وەستا .

پرسیم : ((من و تۆ پێویستە چی کارێ بکەین تاچاکتر بین ؟ ئایا ڕێگای هەردووکمان یەکە ؟

وەلاّم لەلایەن ئەو ڕۆحەوە بوو کەهەفتەی پێشوو باسی لە ئیلهام و گەڕانەوە لە بێهۆشییەوە کردبوو . دەنگی و شێوازی قسەکردن و ئاوازەکەشی ، لەگەڵ دەنگی کاترین و شاعیرانە و پیاوانەی ئەو ڕۆحەی چەند خولەکێ لەوەو بەر دووابوو جیابوو .

((ڕێی هەمووان یەکە . بەگشتی ، ئێمە کاتێ لەلاشەداین پێویستە فێری زۆر شت بین . خەڵکانێک لەئێمە زوتر لەوانی دی فێر ئەبن. ئومێد ، ئیمان ، عیشق ... پێویستە لەسەر هەمووومان ئەمانە بزانین و بەچاکی بیانناسین . زۆر شت کاریگەرە بەهەریەک لەوانە و وەرگەی زۆریش هەن بۆ ئاوەڵا بوونی هەرکامیان . ئێمە تەنها بەمەزەندە کەمێکمان لێیان دەستدەکەوێ ... ))

((کەسانێ کەپەیڕەوی لە ئاینەکان دەکەن پتر لە هەمووومان پێشکەوتوون چونکە بەڵێنیان داوە بەجێبەجێ بکەن فەرمانەکانی خوداو داوێن پاک بن . ئەوان لەزۆرێک لە شتەکان بەبێ چاوتێبڕینی هیچ پاداشتێ خۆشبوون . خەڵکانی دی لەئێمە بەردەوام بەدوای پاداشتەوەین ، پاداشت و هاندانی کارەکانمان ... ئەمە لەکاتێکدایە کە پاداشتێ نییە . ئەو پاداشتانەی بەدوایدا وێڵین لەئەنجامی کارەکانماندایە . ئەنجامدانی کارەکانیش بەبێ ئەوەیە کە هیچ چاوەڕوانیەکمان هەبێ ... ئەنجامدانی کارەکان بەبێ خۆویستی )) .

کاترین بەنەرمیەکەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد : (( من ئەوە فێر نەبووم )) .

دەستەواژەی داوێن پاکی بۆ تاوێ ماتی کردم . بەلاّم بیرم لێکردەوە بنەچەی ووشە کە واتای (سادەو پاکو بێخەوش) دەدات و جگە لەمەسەلەی خۆپاراستنی سێکسیی ئاماژە بۆ زۆر شتی تریش دەکات .

ئەو بەردەوام بوو : «الزیادە ڕەوی نەکردن ... زیادە ڕەوی لەهەموو کارێکدا ... سنور بەزاندن ... تێدەگەیت . بەڕاستی تێدەگەیت ! » دووبارە بێدەنگ بوەوە .

منیش لەگەڵیا وتم : ((هەوڵ ئەدەم )) پاشان بڕیارمدا خەیاڵم لای کاترین نەڕوا ، پێدەچێ هێشتا ڕۆحەکان نەڕۆشتبن .

((چۆنچۆنی ئەتوانم بەچاکترین ڕەوت یارماتی کاترین بدەم دەستبگرێت بەسەر ترس و نیگەرانیەکانیاو وانەکانی فێر بێت ؟ ئایا ئەم ڕێگایە چاکترین ڕەوتە ؟ یان پێویستە شتێ بگۆڕم ؟ یان دوای شتێکی تایبەت بکەوم ؟ چاکترین ڕێگایە بۆ یارمەتی دانی چییە ؟ ))

وەلامەکە بەدەنگە نزم و شاعیرانەکە هات . من خۆمم دا بەسەر لێوی کورسیەکەمدا .

« ئەوەی تۆ دەیکەی ڕاست و دروستە ، ەلام هەموو ئەو شتانە لەبەر خاتری خۆتەو بۆ ئەو نیە . » جارێکیتر پەیام واهات هەموو ئەم شتانە زیاتر لەوەی بەسوودی کاترین بێ بەسودی من بوو .

((بۆ من ؟ ))

« بەڵێ ، ئەوەی ئێمە ئەیڵێین بۆ تۆیە . » ئەو ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکی بۆ کاترین بەکار دەهێنا . بەلام وتی : ((ئێمە )) . دیار بوو چەند ڕۆحێك لەویادا بوون .

پرسیم : (( ئایا ئەکرێ ناوت بزانم ؟ )) یەکسەر لە پوچ و بێمانای پرسیارەکەم پەشیمان بوومەوە . (( من پێویستم بە ڕێنوماییە ، زۆر شت نازانم )) .

وەلاّم شیعرێکی عاشقانە بوو ، شیعرێ دەربارەی ژیان و مردنی من . دەنگی زۆر خۆش و نەرم بوو، وە من هەستم بەعیشقێکی مەعنەوی و بێمەرج و شەرتی ڕۆحێکی جیهانی دەکرد .

**« تۆ لەشوێنی خۆیدا ڕێنومایی ئەکرێی ... لەکاتی خۆیدا . وەختێ بۆ کارێ بۆ ئێرە هاتویی تا ئەنجامی بەی ، ژیانت کۆتای پێدێ . بەلاّم نەك پێش ئەوە . تۆ زەمەنێکی زۆرت لەبەر ماوە ... زەمانێکی زۆر » .**

هەم نیگەران و هەم ئاسوودە بووم . پێمخۆش بوو لەوەی کە زۆر ووردتر لەمە نەبوو . کاترین وەخت بوو نائارام دەبوو . بەکورتی لەبەر خۆیەوە وتی :

**« خەریکە دەکەومە خوار ، دەکەوم ... هەوڵ ئەدەم تا ژیانم بدۆزمەوە ... کەوتنە خوارەوە . »**

ئاخ و ئۆفی ئەکردو منیش ئەم کارەم ئەکرد . ڕۆحە مەزنەکان ڕۆیشتبوون . بیرم لە پەیامە موعجیزە ئاساکانیان دەکردەوە . پەیامی تایبەت لەسەرچاوەیەکی ڕۆحانیەوە . ناوەڕۆکی شتەکانیان زۆر گشت گیر بوون . ڕووناکی و ژیانی دوای مردن ، دیاریکردنی کاتی لەدایکبوون و مردن ، ڕێنومایی حەتمی ڕۆحەکان . قۆناغەکانی ژیان کە پێوانەی کێشانیان وانە فێربوەکان و کارە ئەنجام دراوەکانیەتی نەك ئەو ساڵانەی کەتێپەڕیوون . خێرخوایی ، ئومێد ، ئیمان ، عیشق و کارکردن بەبێ چاوەڕوانی پاداشت . ئەمانە هەموو بۆ من بوون بەلاّم بۆچی مەبەستێك ؟ من لەپێناو ئەنجامدانی چ کارێ نێردرابوومە دونیا ؟

ئەو پەیام و ڕووداوانەی لە عیادەکەمدا گەمارۆیان دابووم گۆڕانێکی ڕیشەیی لە ژیانی تایبەتی و خێزانما خولقاندبوو . وردە وردە ئاگام لەم

گۆڕانانەم بوو . بۆ نمونە جارێ لەگەڵ کوڕەکەم چوین بۆ پێشبڕکێ یەکی (تۆپی باڵە) لە زانکۆ . لە ڕێگە داخراو گیراوەکاندا گیرمانخوارد . هەمیشە لەو ڕێگایانە پەست دەبووم و جا ئێستەش بەو بارەوە یەك دوو بەشی یاریەکەمان لەدەستدەدا . ئاگاداری تووڕەییەکەی خۆم بووم . ڕێگەگرتنەکەم نەخستە ئەستۆی هیچ شۆفێرێکی نەزان . داخی دڵی خۆمم بەسەر کوڕەکەمدا خاڵی نەکردەوەو کاتەکەمان بەقسە کردنەوە بەسەر برد. وادەمان وابوو دوانیوەڕۆیەکی خۆش لەگەڵ کوڕەکەم بەرینە سەر، ئەگەر تووڕە بومایە هەموو ئەو پاش نیوەڕۆیەمان تێکدەچوو .

تەماشای خێزان و منداڵەکانم دەکردو نەمدەزانی ئایا پێشتر پێکەوە بووین یان نا . ئایا خۆمان هەڵمان بژاردبوو لەغەم و شادییەکانی ئەم ژیانەدا هاوبەش بین ؟ ئایا سەرەتای بونمان لە ڕابردووە زۆر دورو نادیارەکانەوەیە؟ هەستێکی زۆرم بە عیشق و سۆز بۆ ئەوان دەکرد. پەیمڕد تاوان و کەموکوڕییەکانیان زۆر لوەکین . ئەم شتانە هیچ گرنگ نین. عەشق گرنگە . تەنانەت پەیم بەوەش برد هەر بەهۆی ئەمەوەیە لەکەموکوڕییەکانی خۆشم بەئاسانی خۆشدەبم . پێویستی نەدەکرد هەمیشە کامڵ بم و هەموو شتێ لەژێر هەیمەنەی خۆما بێت . پێویستی بە کەوتنە ژێر کاریگەری خەڵکی نەبوو .

خۆشحاڵ بووم لەوەی ئەمتوانی لەم ئەزمونەم لەگەڵ (کارول ) هاوبەش بم . شەوان دوای نانی شێو بەزۆری پێکەوە ئەدوایین و من هەست و کاردانەوەکانم دەربارەی دانیشتنەکانی هیپنۆتیزم ی کاترین کۆدەکردەوە . کارول خاوەنی زەینێکی شیکەرەوەیە . ئەو ئەیزانی چەند هۆگرم ئەزمونم لەگەڵ کاترین بەووردی و زانستیانە ئەنجام بگرێ ، وەهەولێئەدا یارماتیم

بدات و بەزانستی لەم مەسەلە بڕوانم . بە کۆکردنەوەی بەڵگە حەساسەکان کە بەیانگری ئاشکراکردنی ڕاستی گەورە بوو لەبارەی کاترین ، کارول نیگەرانی و شادییەکانی منی هەست پێدەکروو تیایاندا بەشدار بوو .

هەفتەی دواتر وەختێ کاترین هات بۆ عیادەکەم خۆم ئامادەکردبوو تا کاسێتی لێدوانە موعجیزە ئاساکانی بۆ لێبدەم. ئەو جگە لەیاداشتەکانی پێشووی شیعری ئاسمانیشی بۆگوتبووم. پێمگوت هەرچەندە لەودۆخەڕۆحانییە یان بەرزەخە هیچ شتێکی بەبیرنایە بەڵام هەندێ زانیاری پاش مردنی بۆم باسکردووە، مەیلی نەبوو گوێ لەکاسێتەکەیش بگرێ. ئەو چونکە تەندرووستی باشتر بوو وەشادومانتربوو ئەیزانی پێویستی بە بیستنی ئەو قسانە نییە. جگە لەمانەش ئەوباسانە بێتاقەتی ئەکردن. من پێداگریم کرد تا گوێی لێبگرێ چونکە ئەو شتانە زۆرگرنگ بوون و هەرلەڕێی ئەویشەوە چنگم کەوتبوون، دەمویست ئاگاداریان بێ. چەند خولەکێك گوێی لەوتە نەرمەکانی خۆی گرت و پاشان داوای لێمکرد تابیکوژێنمەوە! وتی کە ئەوباسانە نائاساییێن و جاڕسی ئەکەن. بەبێ ئەوەی هیچ بڵێم ئەمەم بیرکەوتەوە« ئەمە بۆتۆیە نەك بۆئەو».

نەمئەزانی تا کەی دیدای هیپنۆتیزم بەردەوام ئەبێت. ئەو هەموو هەفتەیە باشتر دەبوو. بەڵام لەدەریای پڕ لە شەپۆلی ئەودا چەند شەپۆلێکی بچوك مابوونەوە. هێشتا لەشوێنە داخراوەکان ئەترسا و پەیوەندی لەگەڵ ئیشتوارت جاڕسی ئەکرد. جگە لەم دووانە لەوانی ترا زۆر پێشکەوتبوو.

چونکەپێویست نەبوو چەند مانگێك دەبوو یەك دیداری "دەرمانی باوی دەروونی"مان نەبوو. بۆچەند خولەکێك دەربارەی دواگۆڕانکارییەکانی هەفتە دووایین و پاشان بەهیپنۆتیزم گێڕامەوە بۆ زەمەنە ڕابردووەکان. کاترین چارەسەرکرابوو ئیتر بەبیرەوەرییە زەبرەڕۆحیە کوشندەکان و زەبرە ڕۆحیە بچوکەکانی ڕۆژانەو گەڕانەوە بۆ ئەزمونەکانی ژیانی پێشووی یان هەرشتێکیتر بووبێ.

تەوژمەکانی ترس و دڵەڕاوکە کەمتر ڕویاندەدا. ئەو ئیتر لەمەرگ و مردن یان لەدەستدانی کۆنترۆڵی خۆی نەدەترسا. ئەمڕۆپزیشکانی دەمارو دەرون لەپێناو چارەسەرکردنی ئەوانەی نەخۆشی کاترینیان هەیە بەڕادەیەکی زۆر سود لەدەرمانە ئارام بەخش و دژە نیگەرانییەکان وەردەگرن. جگەلەدەرمان، نەخۆشەکان لەژێر باری دەرونی بەهێزدا دەبن یان لە کۆبونەوەی دەرمانی بەکۆمەڵ بەشداردەبن. زۆربەی پزیشکانی دەرونی لەوباوەڕەدان نەخۆشییەك بەوچەشنەی کاترین ڕشەو پایەی بایۆلۆجییان هەیەو، کەمبوونەوەو چارەسەریان لەچەند هۆرمۆنێکی کیمیاییدان لەمیشکدا.

لەخەواندنی کاتریندا بووم لەبەر خۆمەوە وتم چەند گرنگە لەماوەی چەند هەفتەیەکدا بەبێ بەکار هێنانی داوو دەرمانی باو باش بووە. ئەم چارەسەرکردنە تەنها بۆسەرکوتکردنی پاڵنەرەکانی نەخۆشی و یان دەربازبوون لەژیانێ بەترسەوە نەبوو، بەڵکو دەرمانێکی سروشتی و لەناو بەری ڕەگو ڕیشەی نەخۆشیکەبوو. کاترین زیاد لەوەی من چاوەڕوانیم لێدەکرد شاد و ئارام و دڵخۆش بووبوو.

دووباره دەنگەکەی نەرم و ئارام بووبوەوە(( من لەبالأخانەیەکم. سەقفێکی وەك گومەزی هەیە. سەقفەکە، شین و ئاڵتونییە. خەڵکی کەشم لەگەڵە. جلەکانیان... کۆنە...چەشنە ڕۆبێکە زۆر کۆن و پیسە.نازانم چۆنچۆنی چووین بۆئەوێ. پڕە لەوێنەی دەمووچاو. هەندێ پەیکەریشی لێیە، لەسەر پایە بەردینەکان دانراون. پەیکەرێکی گەورەی ئاڵتونی لەوپەڕی ژورەکەیە. وادەردەکەوێ... زۆرگەورەیە، باڵی هەیە. لەشەیتان دەچێ. هەوای ناو ژورەکە زۆر گەرمە زۆر گەرم... هیچ پەنجەرەیەکی تیادا نییە. ئەبێ ئێمە لە گوندەکەمان دووربین. کێشەو گرفتێکمان هەیە )).

((نەخۆشی؟))

(( بەڵێ. هەمووومان نەخۆشین. نازانم نەخۆشییەکەمان چییە، پێستمان ووشك هەڵدەگەڕێ و دەمرێ. ڕەش دادەگەڕێ. هەست بەسەرمای زۆر دەکەم. هەوا زۆر وشکە، زۆر بۆنی ناخۆشە. ناتوانین بۆ گوندەکە بگەڕێینەوە. ئەبێت لەدەرەوەی گوندەکەبین. دەمووچاوەکان هەندێکیان گۆڕاون)).

ئەم نەخۆشیە وەك گەڕی "گولی" مەترسیداربوو. ئەگەر کاترین تەنها یەکێ لە ژیانەکانی بەخۆشی بردبێتە سەر هێشتا پێی نەگەیشتبووین.

(( دەبێ تاکەی لەوێ بمێنیەوە؟))

بەحەسرەتێکەوە وەڵامی دایەوە:(( تا هەتایە، تا کاتی مەرگ. ئەم نەخۆشیە تیمار ناکرێ)).

((دەزانی ناوی ئەم نەخۆشیە چییە؟))

(( نازانم، پێست وشک دەکاو دەترەکێنێ. من ساڵانێکی زۆر لەوێ بووم. خەڵکانێک تازە بۆئێرە هاتوون. ڕێی گەرانەوە نییە. ئێمەیان دەرکردووە... تابمرین)).

بەرگەی ژیانێکی پڕلەچەرمەسەری گرتبوو. ژیان لەئەشکەوتدا.

((ئەبێ بۆخۆراکمان ڕاوبکەین. ئاژەڵێکی دڕندە ئەبینم، ئێمە ڕاوی ئەکەین... شاخی هەیە. قاوەییەو شاخدارە، شاخی گەورە)).

((کەس بۆبینینتان دێت؟))

((نەخێر، ناتوانن لێمان نزیک ببنەوە دەنا توش ئەبن. ئێمە نەفرەت لێکراوین...بەهۆی ئەنجامدانی کارێکی خراپەوە. وەئەمەش تۆڵەی ئێمەیە.)) لەژیانە جیاوازەکانیدا مەزهەبەکانی دەگۆران. تەنها لەپاش مردن و لەپلەی ڕۆحدا بەدڵنیایی و ئارامی دەگەی.

((ئەزانی سالی چەندە؟))

((نازانم لەچ زەمەنێکداین. نەخۆشین، هەر چاوەڕوانی مەرگین)).

((هیچ ئومێدێك نییە؟))هەستم بەنائومێدییەکەی دەکرد.

(( هیچ ئومێدێک نییە. هەمووومان ئەمرین. دەستەکانم دێشێن و گشت لاشەم لاوازبووە. من پیرم. ڕۆشتن بۆمن دژوارە)).

((وەختێ کەئیتر ناتوانی جوڵەبکەیت چی ئەبێ؟))

((دەبرێینە ئەشکەوتێکی ترو لەوێ ئەمێنینەوە تا دەمرین)).

((چی لەمردووەکان دەکەن؟))

((دەمی ئەشکەوتەکەئەگرن)).

((ئایا بەرلەوەی کەسێك بمرێ دەمی ئەشکەوتەکەیان لێبەستووە؟)) وەدوی سەرەداوێك بۆ ترسەکانی لەشوێنە داخراوەکان بووم.

«نازانم، قەت لەوێ نەبووم. لەگەڵ خەڵکی تردا لەژووریکدایین. هەوازۆرگەرمە، لای دیوارەکەدام و درێژ ڕاکشاوم».

((ئەو ژوورە بۆچی کارێکە؟))

«بۆ پەرستشە...خواوەندی زۆرە. زۆرگەرمە».

لەزەمەن بردمە پێش. «شتێکی سپی ئەبینم. شتێکی سپی ئەبینم، جۆرە موبیلێکە. یەکێک ئەجوڵێنێ».

((ئەوکەسەتۆی؟))

«نازانم. مردن بەلامەوە خۆشترە، هەموولاشەم دێشێ.» لێوەکانی لەتاو ئازار باریك بووبوون، وەبەهۆی گەرمای ناوئەشکەوتەکەوە هەناسە بڕکێی بوو.

«ئا، ئێرەزۆرگەرمە... زۆر... گەرم، زۆرتاریکە. ناتوانم هیچ ببینم... وەناشتوانم جوڵەبکەم.» سەرەمەرگابوو. لەئەشکەوتی تاریك و گەرما تەنهاو ئیفلیج بووبوو. دەمی ئەشکەوتەکەیان لێ هەڵچنیبوو. تیاماوو ترسابوو. هەناسەدانی نارێك و خێرابوو. خۆشبەختانەمردوو کۆتایی بەوژیانە پڕچەرمەسەرییە هێنا.

«هەست بەسوکبونێکی زۆردەکەم... وەك باری مەلەکردن. ئێرە پڕلەڕوناکییە. ناوازەیە».

((ئازارت هەیە؟))

«نەخێر!» وەبێدەنگ بوو، من چاوەڕوانی ڕۆحەمەزنەکان بووم بەلام بەزویی بردیان.

«بەخێرایی وەختەدەکەومە خوار. خەریکەدەچمەوە بولاشەیەك!» ئەویش هێندەی من سەرسام بوو.

«بالآخانەی زۆر ئەبینم، ستونەکانیان خڕە. ئێمە لەدەرەوەین. دارودرەختی لێیە. داری زەیتون لەملاولاومن، زۆرجوانن. ئێمە لەشتێک ئەڕوانین... خەڵکی دەمامکی سەیرسەیریان کردوەتەسەر. دەمامکەکان دەموچاویان دادەپۆشێ. بۆنەو مەراسیمێک لەپێشە. خەڵکی جل و بەرگی درێژو دەمامکیان پۆشیوە. واخۆیان نیشان دەدەن شتێکی ترن. ئەوان لەسەرسەکۆیە... لەبەرزیەک لەچاوئێمە دانیشتوون».

((تەماشای نمایشەکەدەکەیت؟))

«بەڵێ»

((شێوەت چۆنە؟ سەیرێکی خۆت بکە)).

«قژم قاوەییە. وەپەلکە.» وەستا. ئەووەسفانەی لەخۆی و دارزەیتونەکەدەیکرد منی خستەوە یادی ژیانە یۆنانیەکەی کە دووهەزارو پێنج سەد ساڵ پێش زاین بوو ئەو وەختەی من مامۆستای بووم"دبوژن". وتم بامەسەلەکە یەکلا کەمەوە.

(( مێژووەکەی ئەزانی؟))

« نەخێر»

(( کەست لەگەڵە بیناسی؟))

« مێردەکەم لەلاما دانیشتووە. ئەو ناناسم "لەژیانی ئێستایدا"».

(( منداڵت هەیە؟))

« حامیلەم.» چۆنییەتی لێدوانەکانی زۆر سەرنجڕاکێش و شێوازی کۆن بوون، وەك لێدوانەکانی کاترین نەبوو.

(( باوکت لەوێیە؟))

« نایبینم. تۆلەوێی... بەڵام لەگەڵ من نیت.» ڕاستمکرد. سی و پێنج سەدە گەڕابووینە دواوە.

(( من لەویّ چینەکەم؟))

« هەر سەیر ئەکەیت بەڵام تۆمامۆستای منیت. وانە ئەڵێیتەوە ... ئێمە لەتۆوە فێری چوارگۆشەو... بازنە... وەشتی تریش بووین. "دیوژن!" تۆلەوێی».

((چیتر دەربارەی من ئەزانی؟))

« تۆ پیربوویت. ئێمە خزمی یەکترین... برای دایکمی».

((کەسی تری خێزانەکەم ئەناسی؟))

« هاوسەرو منداڵەکانت دەناسم. تۆ چەند کوڕێکت هەیە، دووانیان لەمن گەورەترن. دایکم مردووە. هەربەگەنجی مرد».

(( باوکت تۆ‌ی بەخێو کردوە؟))

« بەڵێ ، بەڵام ئێستە من شووم کردووە».

((چاوەڕوانی منداڵت ببێت؟))

« بەڵێ، بەڵام دەترسم. ناخوازم لەکاتی لەدایک بوونی منداڵەکەمدا بمرم».

((دایکت وای بەسەردا هات؟))

« بەڵێ.»

((وەدەترسی تۆش هەمان شتت بەسەرابێت؟))

« بەڵێ ئەترسم. بەزویی منداڵەکەم دەبێت. زۆر ئاوساوم، جوڵانم سەختە... ساردە.»

ئەو خۆی لەزەمەن چوبووە پێشتر. منداڵەکە لەلەدایك بووندا بوو. کاترین هەرگیز منداڵی نەبووبوو. ئێمەش لەماوەی چواردە ساڵی ڕابردووەوە لەزەمەنی زانکۆوە لەکۆلێژی پزیشکی بەشی مناڵبوون ، مناڵمان نەبووبوو.

پرسیم (( لەکوێی؟))

(( لەسەر بەردێ ڕاکشاوم. هەواساردە. ژانم هەیە... پێویستە یەکێك یارمەتیم بدات. پێویستە کەسێ یارمەتیم بات.)) پێموت هەناسەی قووڵ بدات ئیتر منداڵەکە بەبێ ژان لەدایك ئەبێت. هەناسەبڕکێی بوو هاواری دەکرد. ژانی منداڵبوون چەند خولەکێکی خایاند و پاشان منداڵێکی کچی بوو.

(( ئێستە تەندروستیت باشترە؟))

(( زۆر بێهێزم... خ ێنێکی زۆرم لێڕۆیشتووە)).

(( ئەزانی ناوی دەنێی چی؟))

(( نەخێر، زۆرماندووم... منداڵەکەمم دەوێ)).

(( منداڵەکەتی لێیە... کچێکی جوانکیلە)).

(( بەڵی، مێردەکەم خۆشحاڵە.)) زۆر ماندوو بوو. پێموت بۆماوەیەکی کەم بنوو پاشان کەهاتیەوە سەرخۆت هەستە. پاش چەندخولەکێك لەخەو بێدارمکردەوە.

(( ئێستا باشتری؟))

(( بەڵی... هەندێ ئاژەڵ ئەبینم... باریان پێهەڵدەگرن. سەبەتە بەسەر پشتیانەوەیە. ناو سەبەتەکانیش شتی زۆی تیایە... خۆراك... میوەی سور...)).

(( شوێنێکی خۆشە؟))

« بەڵێ، خۆراکی زۆرە».

(( ناوی شوێنەکە ئەزانی؟ ئەگەر ڕێبوارێ ناوی گوندەکەت لێبپرسێ پێی دەڵێی چی؟))

« کاتنیا، کاتنیا».

منیش وتم: (( لەوەدەچێ شارێك بێت لە یۆنان)).

«نازانم، تۆدەزانی؟ تۆماوەیەك لەدێکەمان دوربویت و پاشان گەڕایتەوە بۆ ئەوێ . بەلآم من سەفەرم نەکردووە.» ئەمە گۆڕانێك بوو. لەو قۆناغەی ژیاندا من خاڵی و گەورەترو عاقڵتریش بووم لەو، وەلآمی پرسیارەکانمی لەخۆم دەپرسی. بەلآم من ئەو زانیاریانەم چنگنەدەکەوتن و دەستمپێیڕانەدەگەیشت.

پرسیم: (( هەموو تەمەنت لەم گوندەدا بردەسەر؟))

« بەڵێ، بەلآم تۆ سەفەر دەکەیت تا ئاگاداری ئەو وانانەبیت کەدەیانلێیتەوە. سەفەر دەکەیت تاشت فێربیت، تاووڵاتەکان بناسیت و ڕەوت و ڕێگاکانی بازرگانی فێربیت و نەخشەیان بۆ بکێشی... تۆ گەورەتری، لەگەڵ خەڵکی لاودا سەفەردەکەیت لەبەرئەوەی نەخشەکان دەناسی. تۆ زۆر ئاقڵ و دانایت».

(( مەبەستت لەنەخشەکان چییە؟ نەخشەی ئەستێرەکان؟))

« تۆ، نیشانەکان ئەناسی. تۆئەتوانی یارمەتیان بدەیت تا... نەخشە دروستکەن».

(( خەڵکی تری گوندەکەدەناسی؟))

« کەس ناناسم... بەلآم تۆ دەناسم».

(( باشە، پەیوەندیمان چۆنە؟))

«زۆرباشە. تۆزۆر میهرەبانی، من پێمخۆشە لەلات دانیشم. ئارامی دەبەخشیت... تۆ یارمەتی ئێمەت داوە، یارمەتی خوشکەکانمت داوە...».

((بەلاّم لەبەر ئەوەی پیرم کاتێ دێتە پێشەوە کەدەبێ بەجێتان بهێڵم)).

ئەو ئامادەنەبوو بیر لەمردنی من بکاتەوە. « نەخێر. نان دەبینم، هەندێ نانی ساف، زۆر ساف و ناسک».

(( خەڵکی خەریکی نان خواردنن؟))

« بەڵێ. باوکم و مێردەکەم و من و خەڵکی گوندەکەین».

(( بۆنەی چییە؟ دەنگو باس چییە؟...)).

« جەژنێک... جەژنێکی تایبەتە».

(( باوکتی لێیە؟))

« بەڵێ».

(( منالّەکەشت؟))

« بەڵێ، بەلاّم لەلای منا نییە، لای خوشکەکەمە».

وەدوی کەسێکی گرنگ لەژیانی ئێستایدا دەگەڕام، داواملێکرد: (( بەوردی تەماشای خوشکەکەت بکە)).

« ئەو ناناسم».

(( باوکت ئەناسی؟))

« ئا...ئا... ئیدواردە. هەنجیر هەیە، هەنجیرو زەیتون... وەمیوەی سور. نانی ساف و ژمارەیەک مەڕ تۆپێنراون. خەریکن

مەڕەكان دەكەنە كەباب.)) وەستانێكی زۆر، (( شتێكی سپی ئەبينم...))
دووبارە خۆی بردبووە پێش .(( سپییە... سنوقێكی چوارگۆشەیە.
ئەوانەی كەدەمرن دەيانخەنە ناويەوە)).

(( كەواتە يەكێ مردووە؟))

(( بەڵێ... باوكمە، نامەوێ تەماشای بكەم. نامەوێ بيبينم)).

(( ئەبێ تەماشای بكەيت)).

(( ئەيبەن بۆئەسپەردەكردن. من زۆر غەمگينم)).

(( ئەی ئەزانی چەند منداڵت هەيە؟)) نەمدەويست خەفەت بخوا.

(( سێ منداڵم هەيە، دووكوڕو كچێ.)) پاش ئەوەی وەكو فەرمان
وەڵامی پرسيارەكەمی داوە گەڕايەوە سەر ناڕەحەتييەكەی خۆی.
((لاشەكەيان خستە ناو شتێك، ژێر جاجمێ... زۆر غەمبار دياربوو.

(( لەو وەختا -نيش مردووم؟))

(( نەخێر، ئێمە خەريكين ئاوی ترێ ئەنۆشين، ئاوی ترێ
لەجامێكدا)). (( ئێستە من شكڵم چۆنە؟))

(( زۆر پيريت)). (( تەندروستيت باشتر بووە؟))

(( نا وەختێ تۆ بمری من تەنها دەمێنمەوە)).

(( ئايا منداڵەكانت مردوون ؟ ئەوان چاودێريت دەكەن)). دڵنيام
كرد:(( بەڵام تۆ بەردەوام ئەبيت. تۆش زۆر ئەزانی. لەئاماندا دەبيت.))
وادياربوو لەحەوانەوەدابێ.

(( ئارامتر بووی؟ ئێستە لەكوێی؟))

(( نازانم.)) لەگەڵ ئەوەی لەم قۆناغەی ژيانيدا ئەزموونی مردنی نەكرد
وادياربوو بەپلەی ڕۆح گەشتبێت. ئەوهەفتە دووقۆناغ لەژيانی بەجوزئياتی

زۆرەوە تەیکرد. من چاوەڕوانی ڕۆحەمەزنەکان بووم بەڵام کاترین هەروا پشوی دەدا. پاش چەند خولەك لە پشودانی پرسیم دەتوانێ لەگەڵ ڕۆحەمەزنەکان بدوێ یان نە.

(( نەگەشتومەتە ئەو ئاستە. تابەو پلەنەگەم ناتوانم)).

ئەو ڕۆژە نەگەشت بەو پلەیە. پاش چاوەڕوانییەکی دوورو درێژ ئەوم بێدارکردەوە.

مەودای دانیشتنی دواترمان سێ هەفتە بوو. لەوماوەی پشوەدا ڕۆژێك لەسەر بەردەلأنی گەرمی کەنار ئاوێك ڕاکشابووم و بوارم هەبوو تا دەربارەی ئەوەی کەبەسەر کاترینا هاتبوو کەمێك بیر بکەمەوە. بیرکردنەوە دەربارەی گەرانەوە بۆژیانە پێشووەکانی لەرێگەی هیپنۆتیزمەوە، پاشان ڕونکردنەوەی تەواوی شتەکان و مەسەلەی وەها کەلەبێداریدا شتێکی ئەوتۆی دەربارەیان نەدەزانی.

لەماوەی سالأنی پزیشکیمدا ڕەنگە هەزاران نەخۆشی دەرونی و ڕۆحیم تیمار کردبێ، سەرۆکایەتی یەکەی دەرمانیم لەئەستۆبووە لەچوار کۆلێژی پزیشکی، سالأنیکی زۆرم لەهۆبەکانی ئۆرژانس(فریاکەوتن) و بەشەکانی دەروونی و کلینیکەکانی دەرەوەی زانکۆو شوێنە جیاجیاکاندا بەسەربردووەو نەخۆشم چارەسەر کردووە. هەموو شتێك دەربارەی خەیالأتی بیستن و بینین و باوەڕە نادروستەکانی شیزۆفیرنیا دەزانم، نەخۆشێکی زۆرم چارەسەرکردووە کە نەخۆشی هیستریاو جۆری تریشیان هەبووە. زۆرجار لەئەنجومەنی نێودەولەتی لێدوانم هەبووە لەسەر ڕوبەڕووبونەوە لەگەڵ بەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر وەزۆرچاك زانیاریم هەیە لەسەر کاریگەریە خراپەکانی مادەی بێهۆشکەر لەسەرمێشك.

کاترین هیچ کام لەم نەخۆشی و نیشانانەی نەبوو، ئەوەشی کەتوشی بوبوو دەرکەوتنی نەخۆشیەکی دەروونی نەبوو. ئەو شێت نەبوو، وەلەڕاستییەکان دانەبڕابوو، لەژیانیشیدا توشی وەهەم(بینین و بیستنی ئەوشتانەی نین و خەیاڵین) وەیان باوەڕە نادروستەکان نەبووبوو.

مـاددەی بێهۆشکەریـشی بـەکار نـەدەهێنا، سـیفەتەکانی هیـستریای تیانەبوو، وەمەیل و ئارەزوی گۆشەگیری و دوورکەوتنەوە لەکۆمەڵگای تیادا بەدینـەدەکرا. سروشـتی بـەئاگابوو لـەوەی کەئـەنجامی دەدا یـان بـیری لێدەکردەوە. لەدەرەوەی کۆنترۆڵی خۆی و خۆکار هەڵسوکەوتی نـەدەکرد، ئەو باسانەی ئەو دەیکردن لەپشت توانـای ئاگاییـەوەبوو بەتایبـەت هەنـدێ لەو باسانە نائاسایی بوون وەك ئاماژەکردن بەڕابردووی من "ئەوزانیاریانەی پەیوەندی بەباوکم و کوڕەکەمەوە هەبوو"پاشانیش هەنـدێ زانیـاری لەسـەر خـۆی هـەبوو کەلەژیانیـدا نەیـدەتوانی بەئاسـانی چـنگی بـێنێ و دەسـتی پێڕانەدەگەیشت. ئـەم زانیـاری و ئەزمونانـە دوور لـە فەرهـەنگ و شـێوازی پەروەردەکردنی و پێچەوانەی زۆرێك لەبیروباوەڕەکەی بوو.

کاترین مرۆڤێکی ئاتەندازەیە سادەو ڕاستگۆیە. کەسێکی خاوەن زانست و دانـایی نییـەو ئەسـتەمە بتوانێـت ئـەو ڕا ـتی و جورئیـات و ڕوداوە مێژووییانەو ئەو شیعرانەی دەیگوتن دەستکردی خـۆیبن. وەك پزیـشکێکی دەرونـی وزانایـەك دڵنیـابووم ئەوشـتانە لەبەشـێك لـەزەینی نائاگایـەوە سەرچاوە دەگرن. هەموو شتێ ڕاسـتیبوون چـونکە تەنانـەت ئەگـەر کـاترین هونەر پیشەیەکی کارامە بوو دووبارە توانـای دروسـتکردنەوەی ئەمـشتانەی نـەبوو. ئـەم زانیاریانـە زیـاد لەسـنور وردوو درشـت و لـەدەرەوەی بازنـەی زانستی ئەودا بوون.

بیرمـدەکردەوە لـەبارەی گـەڕان و توێژینـەوە لەژیانـە پێـشووەکاندا کەئەمیش ئامانجێکی دەرمانی هەبوو، وەختێ پێمنایە ئەم مەیدانە نوێیـەوە بەبێ بەکارهێنانی هیچ داو دەرمانێ چاك بووبـوو. لـەم مەیدانـەدا، هێزێکـی شـیفادەرو بـەهێز هەیـە، هێزێـك زۆر کاریگـەرترە لەدەرمانـە باوەکـان و

پزیشکی مۆدێرن. ئەم هێزە بریتییە لەیادهێنانەوەو زیندووکردنەوەی ڕاستییەگرنگەکان و زەبرەڕۆحیەکانە. نەك هەرئەوەش بەڵکو تەواو کەری ئەو سوکایەتیکردنانەشە کەڕۆژانە بەلاشەو زەین و کەسایەتیمان دەکرێ . لەپرسایرەکانمداو وەختێ قۆناغەکانی ژیانی پێشووم تاوتوێدەکرد وەدوی نمونەگەلێ لەم چەشنە سوکایەتی و بەسوك سەیرکردنانە بووم. لەوانەش وەکو بەکارهێنانی خراپی لاشەو سۆز، هەژاری، وشکەساڵی و بێبارانی ، نەخۆشی، زەلیلی و هتد... هەروەها تراژیدیای دڵتەزێن وەکو زۆرشت : ئەو مردنانەی کەدەبنە هۆی زەبری ڕۆحی، دەستدرێژیکردن، بەلاگشتی و بەکۆمەڵەکان یاخود هەرڕوداوێکی ترسناکی تر کەپێدەچێ شوێنەواری خراپ بەسەر مرۆڤەوە بەجێ بێڵێ.

دەرمانکردنی ئەو"وەکەسانێکیتر کەدواتر بەم چەشنە چارەسەرکران"بەخێرایی سەرسوڕهێنەرەوە پێشدەکەوت. بەلام ئایا ڕونکردنەوەی دی بۆیادەوەرییە پێشووەکانی ژیانی کاترین هەبوون؟ ئایا ئەو یادەوەریانە لەڕێی جینەکانییەوە گوازرابونەوە؟ لەڕوی زانستیەوە ئەمە زۆر ئەستەمە. یادگاری ژینیتیکی پێویستی بەتێپەڕین هەیە لەنەوەیەکەوە بۆنەوەیەکی دی. کاترین لەسەرتاسەری گۆی زەویدا ژیابوو وەزنجیرەی بۆماوەیی ئەو چەندین جار بچڕابوو. لەژیانێکیدا لەگەڵ منداڵەکەیدا لەلافاودا نوقم دەبوو، وەلەژیانێکی تردا یان منداڵی نەبوو وەیان هەر لەلاویدا دەمردو جینی ئەو نەدەگوازرایەوە. ئەی دەربارەی ژیانی پاش مردن و بەرزەخ چی؟ لەم دۆخەدا ئەو هیچ کەسێ نەبوو وەهیچ مادەیەکیبۆماوەیی نەبوو . کەچی یادگارییەکانی بەردەوام دەبوو. نا نەخێر باسی ژینیتیك بۆئێمە شایانی قبوڵ نەبوو.

بەپێی تیۆری"یۆنگ" دەربارەی "ناخود ئاگایی گشتی"سەرچاوەیەکت لەگشت یادەوەری و ئەزمونەکانی مرۆڤ دەتوانی چنگخەی. فەرهەنگە جیاوازەکان تەنانەت لەڕوئیاشدا زۆربەی سومبول و هاوچەشنن. بەپێی دیدگای "یۆنگ"نائاگایی گشتی لەڕێی تاکەوە فەراهەم نابێ. بەڵکو بەڕێگەیەك لەمیشکەوە بەمیراتی دروستدەبێ. بەپێی ئەم گریمانەیە لەهەموو فەرهەنگێکدا ئەنگێزەو وێنەی زەینی نوێ بەبێکاریگەری لەئاداب و رەوشی مێژوویی و فەرهەنگی سەرهەڵدەدەن. من بڕوام وابوو یادەوەرییەکانی کاترین هێندە تایبەت بوون کەلەگەڵ گریمانەی یۆنگدا شایانی ووردبونەوە نەبوون. ئەو سومبول یاخود وێنەی زەینی و ئەنگێزەی جیهانی نیشان نەدەدا. بەتەنها وەسفی دوورو درێژی خەڵك و شوێنە تایبەتیەکانی دەکرد. تیۆریەی یۆنگ گرنگ دیاربوون. سەرباری ئەوانە ئەبوو دۆخی پاش مردن و بەرزەخ ش لەبەرچاو گیرایە.

زانستەکانی کاترین لەگەڵ ئەوەی ووردو درشت بوون لەپشت تواناکانییەوەبوو لەساتی بێداریدا. ئەو شتی وەهای دەزانی کە بواری فێربونیان لەڕێی خوێندنەوەو کتێبەوە نەبوو کەدواتر پشتگوێی خستبن. ئەمەش ئەستەم بوو ئەم زانستەی لەمنداڵیەوە دەسکەوتبێ ، وەلەوویژدانی بەئاگایەوە نەبووپاشان سەرکوتکرابێ.

ئەی ڕۆحەمەزنەکان و پەیامەکانیان چی؟ کاترین تەنها پەیامەکانی بۆمن دەگوتەوەو خۆبەخۆ شتێکی نەدەگووت. حیکمەتی ئەم پەیامانەش لەژیانەکانی کاتریندا پێچەوانە بوون. ئەمزانی ئەم پەیامانە ڕاستین. ئەمەشم نەك بەهۆی ساڵانێکی زۆر دراسەی وردی زەین و مێشك و کەسایەتی خەڵکی

دەزانی، بەڵکو تەنانەت بەرلەوەی باوکم و کوڕەکەشم بێنە دیدارم. زەینیشم بەهەموو زانستە وردوو درشتەکەیەوەو خانەکانی لاشەشم ئەمەی دەزانی.

سەرباری ئەوەی سێ هەفتە دەبوو لەیەك دابڕابووین بەزوویی چوەخەواندنەوە:«ژمارەیەك گۆزە ئەبینم، مادەیەکی چەوری وەك ڕۆن لەناویاندایە». چووبوە ناو لاشەو زەمەنێکی ترەوە.

« ڕۆنەکان جۆراو جۆرن لەناو گۆزەکاندا. وادیارە ئێرە عەمبار بێ شتەکانی تیا هەڵدەگرن.گۆزەکان سوورن... سوور، لەگڵی سوور دروستکراون. هەندێ پیاو لەوێ ئەبینم... پیاوانێك لەئەشکەوتەکاندان. گۆزەکان جێگۆڕکێ دەکەن. دەسبەندیانکردوون و لەجێیەکی تایبەتی دایدەنێن. سەریان سفرکردوون... مووبەسەریانەوە نییە. پێستیان قاوەییە... پێستی قاوەیی ».

((تۆ لەوێ ؟))

« بەڵێ ، دەمی هەندێ لەمەنجەڵ و قاپەکان دەگرم... دەمەکانیان بەمۆم دەگرم».

((ئەزانی ڕۆنەکان بۆ چی شتێ بەکاردێن؟))

«نازانم».

((خۆت ئەبینی ؟ سەیری خۆت بکە. پێم بڵێ چۆنچۆنیت؟)) هەروا کەتەماشای خۆیئەکرد وەستا.

« قژم پەلکە. جلێکی گەورە... لەبەرمایە. پاشکۆیەکی ئاڵتونی بەدەرەوەیەتی».

(( بۆ ئەم مەزهەبیانە "پیاوانە"ئیش ئەکەیت؟))

« ئیشی من گرتنی دەمی قاپەکانە بەمۆم. ئیشم هەرئەمەیە».

((نازانی مەنجەڵ و قاپەکان بۆچی بەکاردێن؟))

((بۆمەراسیمێکی مەزهەبی"ئـاینی" بـەکاریان دێـنن. بـەڵام دڵنیـانیم کە... چییە؟ لـەفافێ بەسـەریانەوە پێـچراوە. شـتێك بەسـەریانەوەیە... وەبەدەستیشیانەوە... تەیرێك ئەبینم ، تەیرێکی ئاڵتونی کەبەگەردنمەوە شـــۆڕبۆتەوە. ســـافە. دەمێکـــی ســـافی هەیـــە، زۆرســـافەو ســـەری بۆخوارەوەیە... بەرەو ڕووی قاچەکانم)).

((بەرەوڕووی قاچەکانت؟))

(( بەڵێ ، ئـەبێت بـەم چەشـنە بەگـەردنا شـۆڕبێتەوە. مادەیـەك... مادەیەکی ڕەش و لکێنەرە. نازانم چییە)).

((لەکوێیە؟))

(( لەقاپێکی مەرمەڕایە. ئەوەش بەکاردێنن، بەڵام نازانم بۆچ کارێك)).

(( ئایا نوسراوێ لەناو ئەشکەوتەکەدا هەیـە بیخوێنیتـەوە بزانیـت نـاوی ولآت ، شوێنێ کەتیادەژیت یان مێژووەکەی بڵێی؟))

(( هیچ شتێ بەسەر دیوارەکانەوە نییـە. دیوارەکـانی سـەختن. نـاوی ئێرەش نازانم.)) ئەوم لەزەمەن برد بەرەو پێشتر.

((چەشنە قاپێکی سپی هەیـە، بەشـی سـەرەوەی ئاڵتونییـە. ئـاڵتونێکی پێوەیە)).

((ناو قاپەکە چی تیایە؟))

(( جۆرە لەفافێك یان مەرهەم. بـەجۆرێ لـەجۆرەکان، هۆکارێکـە بـۆ چوونە دونیایەکی دی)).

((تۆ یەکێکی لەوانەی کە دەبێ بڕوا؟))

(( نا! من لەمەنازانم )).

(( ئایا ئەمە ئیشی تۆیە، ئامادەکردنی خەڵکی بۆ گوزەر لەدونیا؟))

« نەخێر، مەزهەبیەکان ئەبێت ئەم کارە ئەنجام بدەن نەک من. ئێمە تەنها مەرهەم و ماددەی بۆن خۆش ئامادە دەکەین...».

((چەند ساڵی؟))

« شانزە ساڵ».

(( لەگەڵ باوک و دایکتا دەژیت؟))

« بەڵێ، لەخانویەکی بەرد، زۆر گەورە نییە. زۆر وشک و گەرمە ».

((بچۆرەوە بۆماڵ)).

« من لەوێم».

(( لەماڵەوە کەس ئەبینی؟))

« برایەکە ئەبینم. دایکیشم لەوێیە، وەمنداڵێک ، مناڵی کەسێکە».

(( مناڵی تۆیە؟))

« نەخێر».

(( باشە ئێستە چی شتێك گرنگە ؟ بەرەو ڕووی شتێك بچۆ کە ترس و ناڕەحەتییەکانی ئێستات لەوەوە سەرچاوە دەگرێ. ئێمە ئەبێ بیزانین. بیرهاتنەوەی ئەوەش بێ مەترسییە. بچۆرە لای ڕووداوەکان)).

لەبەر خۆیەوە بەنەرمی وەلامیداوە: « هەموو شتێك لەکاتی خۆیدا ... خەڵکانێک ئەبینم لەسەرەمەرگدان».

(( خەڵکی لەسەرەمەرگدا؟))

« بەڵێ... ناشزانن هۆکەی چییە».

(( نەخۆشییەك؟)) بروسکەیەك لەبیرمیدا کەدووبارە لەساتی ئەزموونکردنی ژیانێکی قەدیمیە. لەو قۆناغەدا تاعونێك کەسەرچاوەکەی ئاو

بوو باوك و برایەكی كاترینی كوشتبوو. كاترینیش نەخۆشكەوتبوو بەلاَم بەو نەخۆشیە نەمردبوو. خەڵكی سیرو گیادەرمانییەكانی دی بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشیە بەكاردێنن. كاترین بێزار بوو چونكە مردووەكان بەپەوشێكی دروست مۆمیایی نەدەكران.

بەلاَم ئێستە لەگۆشەیەكی ترەوە دەهاتە ئەو قۆناغەوە. پرسیم: ((ئایا ئەم نەخۆشیە پەیوەندی بەئاوەوە هەیە؟))

(( ئەوان وادەزانن وابێت . خەڵكانێكی زۆر لەسەرەمەرگدان.)) كۆتایی ڕوداوەكەم ئەزانی.

(( بەلاَم تۆ لەم نەخۆشیەدا نامری؟))

(( نا من نامرم)).

(( بەلاَم نەخۆشدەكەوی؟))

(( بەڵێ، سەرمامە... زۆر ساردە. ئاوی ئەوێ... ئا . وائەزانن نەخۆشیەكە بەهۆی ئاوەوەیە ... وەشتێكی ڕەشیش... یەكێ دەمری)).

(( كێ ئەمرێ؟))

(( باوكم و یەكێ لەبراكانیشم دەمرن، دایكم باشە، ئەو چاكتر ئەبێت. زۆر بێهێزو لاواز بووە. ئەبێ ئەوان خەڵكی ئەسپەردەكەن، خەڵكیش جاڕس و بێزارن چونكە ئەسپەردەكردن پێچەوانەی مەزهەبە)).

سەرسام بووم لەنەبوونی دوالیزمەیی لەیادەوەریەكانیا. دانەدانەی ئەم یاداشتانە هەر ئەوانە بوون كە چەند مانگێ لەوەو بەر گووتبونی. دووبارە بەرێوەنەبردنی ئادابی ئەسپەردەكردن بێتاقەتی كردبوو. ((ئادابی ئەو كارە چۆنچۆنییە؟))

« مردووه‌کان له‌ئه‌شکه‌وته‌کاندا داده‌نێن. لاشه‌کان هه‌ڵده‌گرن بـه‌ڵام سـه‌ره‌تا ده‌بێـت ئامـاده‌بکرێن بۆمه‌زهه‌بییـه‌کان. ئـه‌بێت مه‌رهـه‌میان لێبدرێت و به‌له‌فاف بپێچرێنه‌وه. له‌ئه‌شکه‌وته‌کاندا ئـه‌یانپارێزن . بـه‌ڵام سـیل هـه‌موو جێورێیـه‌کی ته‌نیوه‌تـه‌وه... ئـه‌ڵێن ئـاو بـاش نییـه ئـاو نه‌خۆیته‌وه».

(( ئایا رێگایه بۆچاره‌سه‌رکردنی هه‌یه؟ واته ده‌کرێ شتێ بکه‌یت؟))

« ده‌رمانی گیاییان داوه پێمان، گیای ده‌رمـانی هه‌مـه جـۆر. ئـه‌توانم ‌هه‌ست به‌بۆنه‌کانیان بکه‌م!»

(( ئه‌و بۆنه ئه‌ناسیه‌وه.))

« سپییه. هه‌ڵی ئه‌واسن به‌سه‌قفه‌که‌دا».

(( سیره؟))

« له‌هه‌موو شوێنێک هه‌ڵیان واسیوه... -ه‌لاشه‌کانیان چونیه‌کن... ئـا، ته‌لاشـه‌کانیان ده‌خه‌نـه نـاو ده‌م، نـاو گـوێ، نـاو لـوت، نـاو هـه‌موو شوێنه‌کانیتر. بۆنه‌که‌ی تیژه. باوه‌ڕوایه که‌ئه‌م بۆنه تیژانه نایـه‌ڵن ڕۆحـی ناپاك بێته ناو لاشه‌وه. وه‌نه‌وشه‌یی... میوه یاخود شـتێکی خـڕی تـوێکڵی وه‌نه‌وشه‌یی ئه‌بینم».

(( ئه‌و شته وه‌نه‌وشه‌ییه وه‌ك میوه وایه؟))

« تانیس»

(( بۆچاره‌سه‌ر باشه؟))

«له‌و وه‌خته‌دا وایان ئه‌زانی».

"تانیس." من دووباره‌م کرده‌وه تابزانم باس له‌شتێ ئه‌کات که‌ئێمه پێی ئه‌ڵێن "تانین"یا" ترشی تانیك". ((ئه‌و شته‌یان به‌م ناوه‌وه ده‌برد؟))

« من هەر ... تانیس ئەبیستم ».

((لەم قۆناغەی ژیانتدا چ شتێ هەیە کەلەژیانی ئێستاتدا نادیار بووە؟ هۆی دووبارە گەڕانەوەت بۆ ئەم ژیانەت چییە؟ چی شتێك چارەسەر ئەکات؟))

کاترین بەخێرایی لەژێر لێوەوە وتی:«مەزهەب"ئاین"ی ئەو قۆناغە، مەزهەبی ترس بوو... ترس. ، ،بو لەشتگەلێ بترسایناییە... وەخواوەندێکی بێشومار».

(( ناوی هیچ کام لەخواوەندەکانت وەبیرە؟))

« چاوانێك ئەبینم . ڕەش... شتێکی... وەکو ئاژەڵە. لەپەیکەردەچێت... ئافرەتێك ئەبینم ، خواوەندێك کە شتێکی لەسەرایە.» ((ناوی دەزانی؟... ناوی خواوەندەکە؟))

« "ئوسیریس"... "سایریس"... شتێك هە ـ لەو بابەتانەیە. چاوێك ئەبینم... چاو، تەنها چاوێك . چاوێك بەزنجیرێکەوەیە . لەئاڵتونە».

(( یەك چاو؟))

« بەڵێ... "هاتۆر"کێیە؟»

(( کێیە؟))

« هاتۆر! ئەو کێیە؟»

گەرچی ئەمزانی ئەو " سیریس "ئەگەر دەربڕینەکەم تەواوبێ، براو مێردی "ئایسیس" یەکێ لەخواوەندەکانی میسریەکان بوو. لەژیانما دەربارەی هاتۆر شتێکم نەبیستبوو. دواتر زانیم هاتۆر خواوەندی عیشق و خۆشی و شادی میسرییەکان بووە. پرسیم:((یەکێکە لەخواوەندەکان؟))

« "هاتۆر! هاتۆر!"» وەستانێکی زۆر. «باڵندە... ئەو سافە... ساف، عونقایە*.... » دووبارە بێدەنگ بووەوە.

((ئێستا لەزەمەن بچۆرە پێش، بۆدوا ڕۆژی ژیانت. بەلاّم بەرلەوەی بمری پێم بڵێ چی ئەبینی؟ ))

« ژمارەیە پیاو بالأخانە ئەبینم. کورسی ئەبینم کورسی. پارچەیەکی زبریشی لێیە».

(( چی ئەقەومێ؟ ئێستە بچۆرە ساتی مردنت. چیت بەسەر دێ؟ ئەتوانی بیبینی؟))

« نایبینم... ئیتر خۆم نابینم».

((تۆ لەکوێی؟ هیچ ئەبینی؟))

« نەخێر... تەنها تاریکی... ڕوناکییەك ئەبینم، ڕوناکییەکی گەرم.»

ئەو مردبوو بوبوەوە بەڕۆح. وادیبوو پێویستی بەوەنەبوو دووبارە ئەزمونی مردن بکاتەوە.

پرسیم:(( ئەتوانی بێیتە لای ڕوناکیەکە؟))

« خۆم خەریکە دەچم.» پشووی دەدا. دووبارە چاوەڕوان بوو.

((ئەتوانی تەماشای ڕابردووت بکەیت؟ تەماشای وانەکانی ئەوژیانەت، ئایا ئاگاداریان بوویت؟))

لەژێرلێوەوە وتی: « نا.» هەر چاوەڕوان بوو. دەسبەجێ دەرکەوت کە گورج بووەوە. هەرچەندە لەخەواندنا بوو وە چاوەکانی داخرابوون بەلاّم سەری بەملاو لادا دەسوڕاند.

(( ئێستا چی ئەبینی و چیڕوئەدات؟))

دەنگی گەورەتربوو:« واهەستەکەم یەکێ دەمدوێنێ».

(( ئەڵێ چی؟))

« باس لەحەوسەڵە دەکات. پێویستە مرۆڤ حەوسەڵەی هەبێت...».

(( باشە بەردەوامبە)).

وەلآمەکــە لەلایــەن رۆحــە شــاعیرەکەوەبوو. «حەوســەڵەو زەمــەن بەندی... هەمووشـتەکان لـەوەختی خۆیـدا ڕودەدەن. پێویـست ناکـات لەژیانماندا پەلەبکەین. نابێ بەبەرنامەڕێژی ووردەوە کارەکان پێـشخەین وەک ئەوەی زۆرلەخەڵکی وادەکن.

پێویستە لەسـەرمان ئەوانـەی لەزەمـەنێکی دیـاریکراودا بۆمـان پێـشدێ قبوڵکەین وبەداوی زیاترلـەوە نـەبین. ژیـان بێکۆتایـە، لەبـەر ئەوەئێمـە هــەرگیزنامرین. لەڕاسـتیدائێمە هــەرگیز لەدایکنــەبووین، بــەڵکو تــەنها لەهەندێک قۆناغی جیاوازەوە تێئەپەڕین. کۆتایی نییە. مـرۆڤ مـەوداکانی زۆرن. زەمەنیش بەو چەشنە نییە کەئێمە ئەیبینین، بەڵکو لەو وانانەدایـە کە خوێنراون و فێری بووین ».

پاش وەستانێکی زۆر ڕۆحی شاعیر بەردەوام بوو.

« هەموو شتێکت لەوەختی خۆیـدا بـۆ ئاشـکرائەبێ، بـەڵام پێویـستە بوارو هــەلت هــەبێت تائــەو زانــستەی کــەپێمان دایــت بەباشـی دەرک بکەیت.» کاترین بێدەنگ بوو.

پرسیم: (( ئایاشتێکی ترهەیە کەپێویستبکات فێری بین؟ ))

کاترین بەنەرمی وتی:« ئەوان ڕۆشتن. دەنگی هیچ کەس نابیستم».

---

*عونقا مەلێکی ئەفسانەییە.

هەر هەفتەو ڕۆژێ تێنەپەڕی ترس و دڵەخورپەو نیگەرانییە دەروونیەکانی کاترین کەمتر ئەبوەوە. متمانەی بەنەفسی زیاتر بوو بوو وەخەڵکیش بەورەو لای بەکێشدەبوون. هەستیدەکرد زیاتر خەڵکی خۆش دەوێت و دۆستایەتی بەدۆستی وەلاّم ئەداوە. ناخ و کەسایەتی ڕاستەقینەی هەروەك ئەڵماس پرشنگی ئەداو هەمووان ئەمەیان ئەبینی.

هەرجارێ کاترینم دەخەواند نەمدەزانی ڕشتەی ژیانەکانی لەکوێوە سەردەردێنن. لەئەشکەوتەکانی بەرلە مێژوو تامیسری کۆن یالەزەمەنە نوێکانی ، ئەو لەگشت ئەوقۆناغانەدابووە وەرۆحەمەزنەکانی ، لەشوێنێك لەودیو زەمەنەوە بەئەوینەوە جاودێر بوون بەسەر هەموو ژیانەکانییەوە. لەم دانیشتنەدا لەسەدەی بیستەمەوە سەری دەرهێنا بەلاّم نەك بەناوی کاترین.

(( فرۆکەیەك و باندێك ئەبینم)).

(( ئەزانی کوێیە؟))

(( ناتوانم بزانم... "ئالساتیان"؟))

(( لەفەرەنسا؟))

(( نازانم، هەر ئالساتیان... ناوی"ڤۆن مارکس"ئەبینم ، کلاّوێکی قاوەیی... کلاّوێك بەچاویلکەی ڕەشەوە. لەشکرەکە تیاچووە. وادیارەناوچەیەکی دووردەستە. وانازانم شارێك لەم دەورو بەرەدابێت )).

(( چی ئەبینی؟))

« بالأخانەکان ئەبینم وێران بوون، زەویش لەبۆمبارانـدا کەنـدراوە. ئەو ناوچەیە ژێراو ژووربووە.»

(( ئیشت چییە؟))

« یارمەتی بریندارەکان ئەدەم. بریندارەکان ئەبەین».

(( تەماشـای خـۆت بکـە. باسـی خـۆت بکـە. سـەیرکە بزانـە چـیت لەبەردایە)).

« چاکەتم لەبەردایە. چاوەکانم شینن، چاکەتەکەم زۆر چڵکنە. زۆربەی خەڵکی بریندارن».

(( فێرکراویت چۆن یارمەتی بریندارەکان بدەیت؟ هەرلەوێ ئـەژیت یـان هێناویانی بۆئەوێ؟))

« نازانم"

(( چەن ساڵانی؟))

« سی و پێنج.» کاترین خـۆی بیـست و پێـنج سـاڵان بـوو چاوەکانیـشی ڕەش بوون نەک شین.

((ناوت چییە؟ لەسەر چاکەتەکەت هیچ شتێك نوسراوە؟))

« چاکەتەکەم نیشانەی باڵی لەسەرە. من فڕۆکەوانم... »

(( بەفڕۆکە دەڕۆی؟))

« بەڵێ، ناچارم».

(( کێ ناچارت دەکات بەفڕۆکە بڕۆی؟))

« من ئەفسەری فڕۆکەوانم. ئەمە کاری منە».

(( بۆمبیش تورئەدەیتە خوار؟))

« لەفڕۆکەکەدا عەدەد ڕەشاشێکمان هەیە، لەگەڵ ڕێگە دۆزەرەوەیەکیش».

(( بەچ جۆرە فڕۆکەیەك دەڕۆن؟))

« بەفڕۆکەیەکی کوللەیی. چوار پەروانەی هەیە. باڵەکەی چەسپاوە.»

سەیربوو، کاترین دەربارەی فڕۆکە هیچی نەدەزانی. ئەمویست بزانم چ شتێك لە زاراوەی باڵ چەسپاو دەگات؟ ئەو لەژێر هیپنۆتیزما گەنجینەیەکی فراوانی زانست بوو. وەتەنها کەمێکی ئەوزانستەی لەزەینی بەئاگایدا دەزانی وەك دروسکردنی کەرێ و مۆمیایی کردنی لاشەکان. بەردەوام بووم:

((خانەوادە‌ت هەیە؟))

« لەلای من نین».

(( ئەی لەئەماندان؟))

« نازانم ئەترسم... ئەترسم بگەڕێنەوە. هاوڕێکانم وەختە دەمرن».

(( لەگەڕانەوەی کێ ئەترسی؟))

« دوژمن».

(( دوژمنەکان کێن؟))

« ئینگلیزەکان... هێزەچەکدارەکانی ئەمەریکا... ئینگلیزەکانن».

(( ئەی خانەوادەکەت بیردێتەوە؟))

« ئا بیرم دێنەوە. گشت شتێك شێواوە».

(( باڵەم قۆناغەی ژیانت بگەڕێینەوە دوا بۆزەمەنێکی خۆشتری بەرلەجەنگ، بۆ وەختێ لەگەڵ خاوخێزانا لەماڵەوە بووی. ئەتوانی بیان بینی؟ دەزانم دژوارە بەلام ئاسوودەبە. هەوڵبدەو بیریان بێنەوە)).

کەمێك وەستا. پاشان گووتی:« ناوی "ئەریك"ئەبیستم... منداڵێکی قژبۆر ئەبینم، کچێك».

(( کچی تۆیە؟))

« بەڵێ ، ئەشێ کچم بێت... "مارگوت"».

(( لێتەوە نزیکە؟))

« لەگەڵمایە. ئێمە چوین بۆسەیران. ڕۆژێکی خۆشە».

(( جگە لەمارگوت کەسی ترت لەگەڵە؟))

« ژنێکی قژقاوەیی ئەبینم لەسەر چیمەنەکان دانیشتووە».

(( هاوسەرتە؟))

« بەڵێ... ئەیناسم».

(( مارگوت دەناسی؟ بەووردی سەیریبکە، ئەیناسی؟))

« بەڵێ، بەلاّم دڵنیانیم چۆن چۆنی... لەشوێنێك بیـ ومە».

(( ئەزانی، سەیری چاوەکانی بکە)).

« "جودی"ە.» لەئێستادا جودی چاکترین هاوڕێی کاترین بوو. هەرلەیەکەم دیداریاندا پەیوەندییەکی پتەو لەنێوانیاندا دروست بوو، متمانەیان بەیەك هەبوو وەبەرلەوەی هیچ بلێن پێداویستی یەکتریان دەزانی.

وتمەوە: ((جودی)).

« بەڵێ، هەرلەودەچێ. وەکو ئەو پێئەکەنێ».

(( باشە لەماڵەوەدا خۆشحاڵن یان گرفتار؟))

« گرفتمان نییە.» (وەستانێکی زۆر) « ئا بەڵێ، ساتی بێقەراری و ئاشووبە. کێشەیەکی گەورە لەدەوڵەتی ئەڵمانیادا لە مەسەلەگەلێکی سیاسیدا هەیە. گروپێکی زۆر دەخوازن لەڕەوتی جیاوازەوە بجوڵێن.

دواجـار ئـەم مەسـەلە ئێمـە پارچـە پارچـەدەكات... بـەڵام مـن دەبـێ بۆوڵاتەكەم بجەنگێم».

(( وڵاتەكەت زۆر خۆشدەوێ؟))

« حـەزم بەجـەنگ نييـە. كوشـتن كـارێكی هەڵەيـە بـەڵام پێويـستە جێبەجێكاری فەرمانەكانم بم».

(( ئێستا بگەڕێوە بۆئەو شوێنەی كەلێی بووی، بۆفڕۆكەيە لەسەرزەوی، بۆمبـاران و جـەنگ. ئـاگری جـەنگ هەڵگيرسـاوە. ئينگليزەكـان و ئەمەريكيەكان موشەكبارانی دەورو بەرتان دەكەن. بگەڕێوەدواوە. دووبارە فڕۆكەكە دەبينی؟))

« بەڵێ»

(( هێشتاهەمان هەستت بۆجەنگ و كوشت وبڕهەيە؟))

« بەڵێ ، ئێمە لەخۆر' ئەمرين».

(( چۆن؟))

بەدەنگی بەرز وتی:« ئێمە لەخۆڕا دەمرين».

(( لـەخۆڕا؟ بۆچـی لـەخۆڕا؟ ئايـا شـكۆييەكی تيادانييـە؟ بـەرگری لەنيشتيمان و كەسانێك كەخۆشتدەوێن؟))

« ئێمـە تـەنها لـەپێناو بـەرگريكردن لـە ئايـديای چەندكەسـێكدا دەمرين».

(( تەنانەت ئەگەر ئەوچەند كەسە ڕابەری وڵاتيش بن؟ ئەشـێ ئـەوانيش بەهەڵەدا بچن؟)).

دەسبەجێ قسەكەمی بڕی:« ئەوانـە ڕابـەر نـين. ئەگـەر ڕابەربونايـە ئەوەندە ڕكابەری و ناكۆكی ناوخۆيی نەدەبوو... لەدەوڵەتدا».

(( هەنـدێك لەخـەڵك بەدێوانـەیان ئـەزانن، ئەمـە لـەلای تۆمانـای هەیە ؟دێوانەی هێز؟!))

« پێئەچـێ هـەمووومان دێوانـەبین بیـەڵین وادارمانکـەن ... تاخـەڵك بکوژین، و خۆشمان بکوژین...».

(( ئایادۆستێکت بۆماوە؟))

« بەڵێ، هێشتا هەندێکیان زیندوون».

(( کەس هەیە بەتایبـەتی لێیـەوە نزیـك بێـت؟ لـەلای فڕۆکەچیەکە...؟ هێشتا عەدەد ڕەشاش و ڕێدۆزەرەوەکەت ماون؟))

« ئەوان نابینم، بەڵام فڕۆکەکەم لەناو چووە».

(( دووبارە بەفڕۆکە دەڕۆیت؟))

« پێویـستە پەلەبکـەین تائـەو فڕۆکانـەی مـاون لەبانـدەکان دوورخەینەوە... بەرلەوەی ئە[illegible] بگەڕێنەوە».

(( بچۆرەناو فڕۆکەکە)).

« نامـەوێ بـچم.» وەهارەفتـاری دەکـرد دەتـووت ئـەتوانێ لەگـەڵما موناقەشەبکات.

(( بەڵام پێویستە لەزەوی دوریخەینەوە)).

« زۆربێمانایە...».

(( بەرلەهەڵگیرسـانی جـەنگ پیـشەت چـی بـوو؟ لەبیرتـە؟"ئـەریك"چ کارەبوو؟))

« مـن، لەفڕۆکەیـەکی بـچوکدا... چەشـنە فڕۆکەیـەکی بارهـەڵگر، یاریدەدەری فڕۆکەوان بووم».

((کەواتە ئەو وەختەش هەرفڕۆکەوان بووی؟))

(( بەڵێ)).

(( ئەو پیشەیە زۆرتۆی لەماڵ دائەبڕی؟))

بەنەرمی و تاسەوە وەڵامیداوە:(( بەڵێ)).

پێموت: ((لەزەمەن بچۆرەپێش، بۆهەڵفرینی فڕۆکەی دواتر. ئەتوانی ئەوە بکەیت؟))

(( فڕینی ترمان نییە)).

(( کارەساتێك ئەقەومێ؟))

(( لەئاگرهەڵدێم. ئاگر، وەختە گروپەکەم پەرتدەکات)).

(( بەسەلامەتی ڕزگارت دەبێ؟))

(( کەس بەسەلامەتی دەرناچێ... هیچ کەس لەجەنگدا گیانی بەسەلامەتی دەرناچێ. منیش وەختە بمرم!)) هەناسەی توند بووبوو. (( خوێن! داروبەرد هەرخوێنە! ئازارێك لەسنگماهە ە. گوللەی بەرکەوتووە... قاچ و گەردنیشم هەروەها. ئازارم زۆرە...)) ئازاری ئەچەشت بەڵام بەزوویی هەناسەی ڕێکبووەوە. ماسولکەکانی دەمووچاوی لەهەڵئاوسان دەرچوون و گۆڕانم تیا بەدیکرد.

(( وادیارە ئاسودە بووی. تەواو بوو؟)) هەڵوێستەیەکم کرد. بەئارامی وەڵامیداوە:(( هەڵاژاوم... لەلاشەم دوور دەکەومەوە، ئیتر لاشەم نییە. دیسان هەر ڕۆحم)).

(( زۆرباشە پشووبە. قۆناغێکی دژوارت بردەسەر. مردنێکی مەرگەسات بارت هەبوو. ئیستا پێویستت بە پشوودانە. هێز بەخۆت بدە. لەوقۆناغەی ژیانت چ شتێ فێر بووی؟))

(( فێـری نـەفرەت... کوشـتنی بێمانـا... نـەفرەتی نابـەجێ بـووم. پیاوانێــک نــەفرەت بــارن و وناشــزانن بــۆ. ئێمــە دەدرێــین بــەو هێزانە... بەهۆی جەنگەوە... وەختێ لەلاشەماندایین...)).

(( ئایا فـەرمانێکی گـەورەتر لـەڕێی خزمـەتکردنی نیشتیماندا هەیـە؟ شـتێك ... شـتێ کـە بتـوانێ پێشبگری لەکوشـتنی خـەڵك لەلایـەن تـۆوە؟ تەنانەت ئەگەر فەرمانیشت پێدەدرا؟ فەرمانێکی خۆشت؟))

(( بەڵێ.)) بەڵام باسینەکرد.

(( چاوەڕوانی شتێکی؟))

(( بەڵێ... چاوەڕوانم بـچمە دۆخێکـی نوێـوە. پێویـستە چـاوەڕێبکەم. بەدوامدا دێن... ئەوان دێن...))

(( پێم خۆشە وەختێ هاتن قسەیان لەگەڵ بکەم.)) چەند خولەکێکی تر چاوەڕێمانکـ . پاشان کت و پڕ دەنگی بەرزوو تورەبوو. ئەو ڕۆحە؛ بەکـەم جار دەدوا نەك ڕۆحە شاعیرەکە.

(( گومانەکەت دەربارەی ئەوەی ئەم چارەسەرە بۆئەو کەسانەیە کـە لـە لاشـەدان ڕاسـت دەرچـوو. پێویـستە تـرس لەمێـشکیاندا دەرکـەی. هــەبوونی تــرس ئەبێتــە هــۆی بەفیرۆچــوونی هێــز. هەرترســە نایــەڵێ ئەوکارەی بۆئەنجامدانی هاتوون بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدەن. پێویستە یەکەمجار بچنە قوڵایی پلەیەکەوە... جێگایەك کە تیایدا نەتوانن هەست بەلاشــەکانتان بکــەن. ئــیتر ئــەو وەختــە ئــەتوانی پەیوەنــدیان لەگەڵــدا بکەیت.گرفتەکان... بەتەنها لەئاستەکاندان. لەقوڵایی ڕۆحیانداو جێگەیـە کــەبیرو بــاوەڕ دێنــە ئەفرانــدن پێویــستە پەیوەنــدیان لەگەڵــدا درووستبکەیت)).

«هێز ... هەمووشتێک بریتییە لەهێز. هێزێکی زۆر بەهەدەر ئەچێت. چیاکان...، ناخی چیاکان ئارامە، ناوەندەکەی ئارامە، بەلأم گرفتەکە لەڕووی دەرەوەیدایە. مرۆڤەکان لەتوانایاندایە تەنها ڕوی دەرەوەی شتەکان ببینن، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ دەتوانی بچیە ناو قولأییەکی پتر. تۆ پێویستە گرکانەکان ببینی. بۆدیتنی ئەوەش پێویستە بچیتە قولأیی».

« ڕۆح لەناو لاشەدا بارێکی نائاسایی تەیدەکات. وەختێ ڕۆحین هەست بەبوونی سروشتی خۆمان دەکەین. ئەوساتەی دەمانگێڕنەوە، وەک ئەوەوایە بەرەو ڕوی شتێکی نەناسراو بنێرێین. زەمەنێکی پتر ئەخایەنێ. لەدونیای ڕۆحدا دەبێ سەبر کەیت، پاشان نوێدەبێتەوە. ئەم ڕەهەندە وەکو ڕەهەندەکانی ترەو تائاستێک تۆ لەگەشتن پێی سەرکەوتووبوویت...».

ئەم مەسەلە منی سەر، 'مکرد. چۆن چۆنی توانیبووم لەدۆخی نوێ و نوێبونەوە نزیک بووبێتمەوە؟ بەگومانەوە وتم: (( من تائاستێك پێیگەشتووم؟))

" بەڵێ، تۆ زۆر زیاتر لەخەڵکی دەزانی. زۆر زیاتر تێدەگەیت، ل گەڵیاندا هێمنبە. خەڵکی لەو زانستەی کەتۆ ئەیزانی بێخەبەرن. چەند ەجێک بۆیارمەتی دانت دەنێرێنە لات! ئەوەی خەریکی ئەنجامدانیتی درووستە... لەسەری بەردەوامبە. نابێ ئەم هێزە بە هەدەر بچێت. ترس لەخۆت دوورخەرەوە . ئەمە گەورەترین چەکێکە کەلەبەردەستایە...».

ڕۆحەمەزنەکە بێدەنگ بوو. بیرم لەمانای ئەم پەیامە ناوازەیە دەکردەوە. ئەمزانی بەسەرکەوتوویی ترس لەناخی کاترین هەڵدەنێم بەلأم

ئەم پەیامە چەمکێکی فراوانتری هەبوو کەزیاتر جەختکردنەوەو کاریگەری هیپنۆتیزم بوو وەکو هۆکارێکی دەرمانی، نەك وەکو هۆکارێك بۆگەڕانەوە بۆ ژیانەپێشووەکان. چونکە ئەستەم بوو بتوانرێ یەك بەیەکەی خەڵك ببەیتەوە بۆ ژیانەکانی پێشوویان. تا من لام وابوو ئەم پەیامە دەربارەی ترس لەمەرگ بوو، ترسێ کەلەقوڵایی گرکانەکاندا هەیە. ترس لەمەرگ ئەوترسە نادیارو بەردەوامەی کەسەروەت و سامان و هێز ناتوانن بێ ئەسەری کەن. ئەمە ڕاستیی مەسەلەکەیە. بەڵام ئەگەر خەڵکی ئەیانزانی ژیان بێکۆتایەو ئێمە هەرگیز نامرین کەڕاستییەکەی ئەوەیە هەرگیز لەدایکنەبوین، ئەوسا ئەم ترسە نەدەما. ئەگەر ئەیانزانی لەڕابردوودا چەند ژیانێ ژیاوین و لەداهاتوشدا چەند جارێکی تریش ئەژین ، چەندە هەستیان بەدڵنیایی پتر ئەکرد. ئەگەر ئەیانزانی لەم دۆخەی کەلەلاشەدان ڕۆحگەلێك لەپێناو یارمەتی و پاراستنیان لـ ەورو بەردان و لەپاش مردن و لەپلەی ڕۆحدا پەیوەند دەبن بەم ڕۆحانەوە کە هەمان دۆستانی مردوویانن، چەندە ئاسودەتر ئەبوون. ئەگەر ئەیانزانی فریشتەکانی پاراستن ڕاستەقینەن و هەن، چەند هەستیان بە ئاسایش دەکرد. ئەگەر ئەیانزانی ناداد پەروەری و توندی لەگەڵ خەڵك بەبێ تۆڵە لێسەندنەوە نامێنێ و لەژیانەکانی پاشتردا دەبێ بەهەمان ڕێژە قەرەبوی بکەنەوە، چەند کەمتر تورەدەبوون و کەمتر دوای تۆڵە کردنەوە ئەکەوتن.

بەڵام چۆن چۆنی ئەتوانین ئەم زانستە بەخەڵکی بگەیەنین؟! زۆربەی خەڵك لەکلێساکاندا، لە کەنیسەکاندا، لەمزگەوتەکان و یان پەرسگاگاندا لەخودا دەپاڕێنەوە، پاڕانەوەیە کەبانگەشەی فەنا قایلی ڕۆحی تێدایە، بەڵام هەرئەوەندەی پەرستنەکانیان تەواو بوو ئیتر دەگەڕێنەوە ژیانی پڕ لە

کێــشمه کێــشم و ململانــێ و ئــەبینی هــەمان ئادەمییــە تــەماعکارو خۆویستەکەن. ئەم سیفەتانە پێشکەوتنی ڕۆح ڕادەگرێ. لەبەرئـەوە ئەگـەر ئیمان بەس نەبێت ڕەنگە زانست بتوانێ کاریگەرتربێت . ڕەنگـە ئـەزمونێکی وەکـو ئـەزموونی مــن و کـاترین پێویــستبێ بەشــێوەی زانــستی جێــی توێژینـەوەو باسـکردنبێ و بخرێنـە بـەردەس زانایـانی زانـستی و فیزیکـی و خەڵکی. لەگەڵ ئەمانەشدا تەنانەت نوسینی ووتارێك یـان کتێبێکـی زانستی بەمێشکمدا نـەهات. بـیرم لەڕۆحـەکان ئـەکردەوە کـەبڕیاربوو بێنـە لام بـۆ یارمەتی دانم . یارمەتی لەپێناو ئەنجامدانی چ کارێك؟

کاترین جوڵەیەکی کردوو هاتە دووان: (( کەسـێك نـاوی "گیـدیون"ە ، کەسێ بەناوی گیدیونەوە ... دەخوازێ قسەم لەگەڵ بکات)).

(( چی دەڵێ؟))

(( ئەو ل' ئەموو شوێنێکدا هەیە. ڕاناوەستێ. پارێزگاریکەرە.. بـەڵام ئێستە یاریم لەگەڵ ئەکات)).

(( ئەو یەکێ لە پارێزەرانی تۆیە؟))

(( بەڵێ، بەڵام یاریـدەکات... لـەدەوورو بەرماهـەردێت و دەچـێت. وابـزانم مەبەسـتیە تێمگەیـەنێت کـە لـە دەوورو بەرمایـە... لەهـەموو جێگایەك)).

وتمەوە (( گیدیون؟))

(( ئەو لەوێیە)).

(( ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەست بەئاسودەیی زیاتر بکەیت؟))

(( بەڵێ. هەرکاتێ پێویستم پێی بێ دەگەڕێتەوە)).

(( ئەی ئایا ڕۆحەکان لەدەوورو بەرمانن؟))

(( ئۆه، بەڵێ... ڕۆحی زۆرهەن. بەڵام کاتێک دێن کەمەبەستیان بێ. ئەوان... وەختێ مەیلیان بێ دێن. ئێمە هەمووومان ڕۆحین. بەڵام خەڵکی... هەندێک لەلاشەدان و تاقمێ لەقۆناغی نوێبونەوەدان و هەندێکی تر پارێزەرن. بەڵام هەمووومان دەچینە ئەوێ. ئێمەش پارێزراو بووین)).

(( بۆچی بۆفێربوون دەگەڕێینەوە؟ بۆ ناتوانین وەختێ لەپلەی ڕۆحداین فێرببین؟))

(( ئەوانە قۆناغە جیاوازەکانی فێرکارین، ئاستی جیاواز. پێویستە ئێمە هەندێک لەوانە لەلاشەی خۆماندا فێربین. ئەبێ هەست بەئازارو نارەحەتی بکەین. ئەوکاتەی ڕۆحیت هەست بەئازار ناکەیت. ئەمە قۆناغێکە لەنوێبونەوە. ڕۆحتان لەساتی نوێبونەوەدایە. ئەووەختەی بوونت هەیە لە لاشەو گۆشت و پێستدا دەتوانی هەست بەئازار بکەیت. بەڵام کەبویت بەڕۆح ''توانیت. لەو دۆخەدا تەنها شادی و هەستکرد بەخۆشی هەیە، بەڵام ئەمە قۆناغێکی نوێیە... چۆنییەتی هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان لەزەمەنێکدا کەڕۆحیت جیاوازە. وەختێ لە لاشەدای دەتوانی ئەزموونی پەیوەندییەکان بکەیت )).

(( تێدەگەم . زۆر باشە.)) دیسان بێدەنگ بوو. چەند خولەکێك تێپەڕی.

(( گالیسکەیەک ئەبینم، گالیسکەیەکی شین)).

(( گالیسکەی منداڵ؟))

(( نەخێر گالیسکەی سواری... شتێکی شینە. حاشیەیەکی شین بەسەریەوەیە... دەرەوەی شینە...)).

(( ئەسپەکان گالیسکەکان ڕادەکێشن؟))

« تایەکانی گەورەیە. کەس نابینم لەناویا، بەلاَم دووئەسپیان پێوە بەستراوە... یەکیان خۆڵەمێشی و ئەوی تریان قاوەییە. ئەسپە خۆڵەمێشیەکە ناوی "ئەپڵە" چونکە حەزی لە سێوە. ناوی ئەوەی تریان "دوک"ە. زۆر ئەسپی چاکن و گاز ناگرن. پێیان گەورەیە... گەورە ».

((ئەی ئەسپی بەدکارو تورە لەوێ هەیە؟ مەبەستم ئەسپی ترە؟))

« نەخێر، ئەم دووانە ئەسپی چاکن».

(( تۆش لەوێی؟))

« بەڵێ، لوتی ئەبینم، گەورەترە لەمن».

(( تۆ گالیسکەکە لێئەخوڕی؟)) لەجۆری وەلاَمدانەوەکەی تێگەشتم کەمنداڵبووە.

« ژمارەیەکی زۆر ئەسپن، کوڕێکیشی لێیە».

، (( تەمەنت چەندە؟))

« زۆرکەم. نازانم. لەوە دەچێ ژماردن نەزانم».

(( ئەو کوڕە دەناسی؟ دۆستی تۆیە؟ براتە؟))

« دراوسێمانە. ئەو بۆ... میوانی هاتووە بۆئەوێ. جەژنێکی شایی... وەیان شتێک لەو بەزمانەیە».

(( ئەزانیت زەماوەندی کێیە؟))

« نازانم، پێیان وتوین خۆمان پاکڕاگرین. من قژم قاوەییە... پێڵاوێکم لەپێدایە لەخوار تاسەر تەرەقەیە».

(( ئەمانە جل و بەرگی میوانیتن؟ جلی جوانن؟))

« جلێکی سپی... لەگەڵ ... شتێکی چیندار بەسەریەوە و لەدواوە گرێدەدرێ».

(( ئایا خانووەکەت لەو نزیکانەیە؟))

« خانوویەکی گەورەیە».

(( لەویادا دەژیت؟))

« بەڵێ».

(( ئێستا ئەتوانی تەماشای ناو ژوورەکە بکەیت، پێناچێت گرفتی تیابێت. ئەمڕۆ ڕۆژێکی گرنگە. خەڵکی جل و بەرگی جوانیان لەبەرکردووە، جل و بەرگی تایبەتی)).

« خەریکی چێشت لێنانن، چێشتێکی زۆر».

(( هەست بەبۆنەکەی دەکەیت؟))

« بەڵێ، خەریکی لێنانی جۆرە خواردنێکن! نان... گۆشت... دیسانیش پێمان دەڵێن بچینە دەرەوە.» پێموتبوو چوونە ژوورەوە گرفتی تیانییەو ئێستا پێی دەڵێن بچێتەدەر.

(( ناوت ئەهێنن؟))

« ... مەندی... مەندی و ئیدوارد».

(( ئەمە ناوی ئەو کوڕەیە؟))

« بەڵێ».

(( نایەڵن لەماڵەوە بیت؟))

« نەخێر، سەریان زۆر قاڵە».

(( لەم بارەوە هەست بەچی ئەکەیت؟))

« بەلامانەوە گرنگ نییە، بەڵام خۆ پاکڕاگرتن دژوارە. هیچ کارێک ناتوانین بکەین ».

((ئەی دواتر لەو زەماوەندەدا بەشداریدەکەیت؟ ))

« بەڵێ... خەڵکی زۆر ئەبینم. ناو ژوورەکە سیخناخ و قاڵە. گەرمە، ڕۆژێکی گەرمە. یەکێکی لێیە... مەزهەبییەکی ناوچەی "پارسۆن" کڵاوێکی خەندەداری لەسەردایە... ڕەشە... بەسەردەمو چاویا دێ... بەشێکی دادەپۆشێ...».

(( لەم وەختەدا ماڵەوەتان شادومانن؟))

« بەڵێ».

(( نازانی کێ شوو ئەکات؟))

« خوشکەکەم».

(( زۆر لەتۆ گەورەترە؟))

« بەڵێ».

(( ئێستە ئەو دەبینی؟ جلی بوکێنی لەبەرکردوە؟))

" بەڵێ».

(( جوانە؟))

« بەڵێ، گوڵی بەسەرەوەیە».

(( بەوردی تەماشای بکە. ئەو ناناسی لەزەمەنێکی تردا؟سەیری چاوەکانی کە، دەمی...))

« ئا ئەو "بیکی"ە... بەڵام بچوکتر... زۆر بچوکتر.» بیکی دۆستی کاترین بوو. بەڵام کاترین کەیفی بە کارە خۆهەڵقورتاندنەکان و فەرمانەکانی نەدەهات. ئەو تەنها دۆستێ بوو بەبەشێك لەئەندامانی خێزانەکەی نەدەهاتە ئەژمار. « ئەو... منی خۆشدەوێ... وەمن ئەتوانم لەلای ئەو و لەژوورەکەدا بوەستم».

(( سەیری دەورو بەرتبکە، دایك و باوکت لەوێن؟))

« بەڵێ».

(( ئەوانیش هێندە تۆیان خۆشئەوێ؟))

« بەڵێ».

(( بەوردی تەماشایان بکە. یەکەم جار دایکت. بزانە شێوەی ئەکەیت؟ تەماشای دەمو چاوی بکە)).

کاترین چەند هەناسەیەکی قوڵیدا. « ئەو ناناسم».

(( تەماشای باوکت بکە. لێبورد بەرەوە، دەموچاوی، چاوەکانی... دەمی. شێوەی ناکەیت؟))

بەخێرایی وەڵامیداوە: « ئەو ئیشتوارتە.)) کەوابوو جارێکیتر ئیشتوارت دەرکەوتبووەوە. ئەم مەسەلە شایانی لێکۆڵینەوەی زیاتربوو.

(( پەیوەندیتان چۆنە؟))

« زۆر خۆشدەوێ... زۆر باشە لەگەڵما، بەڵام لایان و ە من جارسیان دەکەم. ئەو وادەزانێ مناڵەکان جارسکەرن».

(( زۆر جیدییە؟))

« نەخێر دەخوازێ یاریمان لەگەڵدا بکات. ئێمە پرسیاری زۆر ئەکەین بەڵام ئەو لەگەڵمان باشە، سەرباری ئەوەی کەئێمە پرسیار زۆر ئەکەین».

(( ئەم کارە ئەو جارس ئەکات؟))

« بەڵێ، ئێمە پێویستە لە مامۆستاوە فێربین نەک ئەو. هەر لەبەر ئەمەیە کەدەچینە خوێندنگە... بۆ فێربوون».

(( وادیارە ئەوە دەدوێ و ئەوشتانە دەڵێ؟))

« بەڵێ، ئەو ئیشی زۆرگرنگتری هەیە تا ئەنجامدرێ. پێویستە ئەو کێڵگە بەرێوە بەرێت».

(( کێڵگەکە گەورەیە؟))

(( بەڵێ))

(( ئەزانی کێڵگەکە لەکوێیە؟))

(( نەخێر)).

(( قەت ناوی ئەوشارە یان وڵاتە دێنن؟ ناوی شارەکە؟))

وەستاو بەووردی گوێی دەگرت:((شتێکی ئەوتۆ دەربارەی نابیستم.)) دووبارە بێدەنگ بووەوە.

(( زۆر باشە، دەخوازی ئەم قۆناغەی ژیانت پتر تاوتوێ بکەیت؟ دەتەوێت زەمەن بگوزەرێنی یان ئەمەی کە))

قسەکەمی بڕی. (( بەسە)).

بەدرێژایی ئەم ئەزموونەم لەگەڵ کاترین، نەمدەویست باسەکانی ئەو لەگەڵ کە   انی تری پسپۆڕدا باس بکەم. جگە لەکارول و چەند کە   سێکی تر کەمتمانەم پێیان بوو، هیچ کام لەم زانیاریانەم بەکەس نەگوتبوو. ئەمزانی هەموو ئەم شتانەی کە لە ڕێگەی هیپنۆتیزمەوە چنگم کەوتبون هەم زۆر گرنگ و هەم ڕاستە قینە بوون کەچی پەرچەکردارەکانی هاوکاران و پسپۆڕیم بووبوونە هۆی ئەوەی بێدەنگبم. من هێشتا نیگەرانی ناو بانگ و پیشەو ڕای خەڵك دەربارەی خۆم بووم.

گومان و دوودڵیم لەوباسانەی کەهەفتانە لەلێوی کاترینەوە دەهاتنەدەر نەمابوو، زۆربەی کاسێت و ئەزمونەکانی هیپنۆتیزمم گوێ لێ دەگرتەوەو هەمووشیان لەلام پلە یەك بوون. دەبوایە خەڵك ئەم شتانەی لەمنەوە پێبگەشتایە. ڕاستە ئەوشتانە هەموو ئەزموونی بەهێزبوون، بەڵام پلەیەك نەبوون. هەستم دەکرد پێویستە زانیاری پتر کۆکەمەوە.

هەروا کەپەیامەکانم وەردەگرت و باوەڕم پێیان دەبوو ژیانم سادەترو ڕەزامەندی تر دەبوو. پەیوەندییەکانم شەرەفمەندانەترو بێ واسیتە دەبوون. ژیانی خێزانیم کەمتر ناسۆرو زیاتر ئاسودە بووبوو. بێ مەیلیم کەمتر دەبوو لە هاوبەشکردنی خەڵکی لەزانستێ کەلەرێی کاترینەوە هاتبووە دەستم . ئەوە باش بوو زۆربەی خەڵکی هۆگری بوون و ئەیانویست زیاتر بزانن. زۆربەی خەڵك منیان دەخستە ناو ئەزموونە زۆر پلە یەکەکانەوە. ئەم ڕاستەقینەیە دەربارەی هەستی شەشەم، ئەزمونی دەرەوەی لاشەو خەون و خەیاڵاتی پەیوەندی بەژیانی پێشووەوەو جگەلەوانەش هەبوو. زۆربەیان تەنانەت لەگەڵ هاوسەرەکانیشیان نەدوابوون. هەموویان سڵیان دەکردەوە ئەگەر ئەزموونەکانیان بەخەڵکی تر بڵێن ، تەنانەت ئەندامانی خێزانەکانیان و پزیشکەکانیان وادەزانن کە ئەوان نامۆو غەریبن.

بەڕێوەبەری بەشێك لەکلینکەکان لەنەخۆشخانەکەی ئێمە پیاوێکە بەهۆی پسپۆڕیەکەی خۆیەوە لەهەموو دونیادا دەسخۆشی لێدەکرێ. ئەو چەندین جار باوکی لەمەترسی ئاگادارکردوەتەوە بەر لەڕودانی. پرۆفیسۆرێکی تر ڕێگەی شیکاری تاقیکارییە ئاڵۆزەکانی لەخەودا دەدۆزێتەوەو خەوەکانی ڕاستی دەرچوون. پزیشکێکی بەناوبانگ بەرلە هەڵگرتنی تەلەفوون دەزانێ کێیە تەلەفونی بۆ دەکات. هاوسەری بەرپرسی بەشی دەروونی یەکێك لە زانکۆکانی ڕۆژئاوای ناوەڕاست کە بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لەدەروناسیداو توێژینەوەکانی هەمیشە بەوردی و بەرنامەڕێژیەوە پێشکەش دەکرێن، هەرگیز بەکەسی نەگوتبوو وەختێ بۆ یەکەم جار لەشاری" ڕۆم" دا هاتووچۆی کردبوو وەها ڕۆشتبوو کەدەتگووت

نەخشەی ئەوێی لەزەینا بووە. ئـەو بـەبێ هـیچ هەڵەیـە دەیزانـی کەلەپـشت فەرعی دواترەوە چی هەیە. وەلەگەڵ ئەوەی کە هەرگیز نەچووبووە ئیتاڵیاو زمانیشی نـەدەزانی کەچـی ئیتاڵییـەکان بـەزمانی خۆیـان لەگـەڵی دواوون و بەکەسێکی خەڵکی ئەو شارەیان زانیبوو. زەینی ئەو لەهەوڵدانا بوو تارێگایە بۆ دەرککردنی ئەزمونەکانی لەڕۆم بدۆزێتەوە

بـاش ئـەمزانی کەبۆچـی کەسـانی شـارەزاو پـسپۆڕ ئـەم شـتانەیان نەدرکاندووە. منیش یەکێك بووم لـەوان. ئێمـە نەمانـدەتوانی ئینکـاری لـەم شتانە بکەین بەلاّم شـێوازی پـەروەردەو فێرکردنمـان لـەزۆرێك لـەو ڕوانـەوە لەسەداسەد پێـچەوانەی زانیـاری و باوەڕانێـك بـوو کەبەدەسـتمان هێنـابوو. لەبەر ئەوە بێدەنگ ئەبوین.

ئـەو هەفتەیـە بـەخێرای تێپـەڕیکرد . مـن چـەند جارێـك گـوێم لـە کاسێتەکانی هەفتـەی پێشوو گرتـەوە . سـەبارەت بـە چۆنیەتی هـەڵس و کەوت کردنم لەگەڵ (نویَ بوونەوەی ژیان )، هەستم ئەکرد ئـەم باسـە لـەلام ڕون نەبوون. جگە لەوانـەش بڕیـار بـوو ڕۆحـە مەزنـەکانیش بنێرێنـە لام بـۆ یارمـاتی دانم بـەڵام دەبـوو چـیم کردبـا ؟ کـەی ئـەمزانی ؟ ئایـا ئـەو کـارە لەتوانای مندا هەبوو . ئـەمزانی ئـەبیَ چـاوەڕوان بم. وتـەکانی ڕۆحـە مەزنـە شاعیرەکەم هاتەوە بیر کە دەیگوت :

«حەوسەڵەو زەمەن ... هەموو شتێك لەکاتی خۆیدا دێت ... لەساتی خۆیا هەموو شتێکت لاڕوون دەبێ . بەڵام پێویـستە بـوارت هـەبیَ تائـەو زانس. ی پێمان داویت دەرکی بکەیت . » لەبەر ئەوە من تا. ت ئەگرم .

لەسـەرەتای دانیـشتنەکەماندا ، کـاترین بەشـێك لـەو خـەوەی کەچـەند شـەویَ لەوەوبـەر بینیبـوی گێـڕاوە . لـەم خەوەیـدا لـەماڵی بـاوك و دایکـی دەژیا. بەدرێژایی شەو خانوەکەیان ئـاگری گرتبـوو . ئـەو توانـای کـۆنترۆڵی ئەو بـارەی هـەبوەو لەچۆڵکردنی ماڵەکـەدا یارمـەتی ئـەدان ، بـەڵام بـاوکی دەربەست نەهاتوەو گـوێی نـەداوە بـەو بـارە . کـاترین خێـرا بـاوکی لـەماڵ بردەدەر . باوکی بیری کەوتەوە شتێکی لەخانوەکەدا بەجیَ هێشتوە لەبـەر ئەوە کاترینی ناردە ناو کڵپەی ئاگرەکەوە . کاترین بیری نەدەهات ئەو شتە

چــی بــووە . بڕیارمــدا خەوەکــەی بــۆ شــینەکەمەوە تــابزانم لەحاڵــەتی هیپنۆتیزما چی دەقەومێ.

بــەزوویی چــووە خەواندنــەوە . ((ئافرەتێــک ئــەبینم ڕوبەنــدێکی بەسەرەوەیە . دەم و چـاوی دانەپۆشـیوە ، هـەر بەسـەر قژیەوەیـە . )) پاشان بێدەنگ بوو .

((ئێستە ئەتوانی ڕووبەندەکە ببینی ؟)) .

((لێم ون بوو ... پارچەیەکی ڕەش دەبینم ... باڵاخانەیەک دەبینم ... سپی )) .

((باڵاخانەکە ئەناسیەوە ؟ )) .

((نەخێر ، لەپشتیەوە لوتکەی چیایەک دیـارە بـەفری بەسـەرەوەیە . بەڵام شوێنەکەی ئێمە سەوزاییە )) .

((ئەتوانی بچییە ناو باڵاخانەکەوە ؟ )) .

((بەڵێ لەچەشنە مەرمەڕێک دروستکراوە ... کەدەستی لێئەدەیت زۆر ساردە )) .

((پەرستگا یان باڵاخانەی مەزهەبییە ؟ )) .

((نازانم . پێئەچێ گرتووخانە بێت )) .

((گرتووخانە ؟ کەس لەناو باڵاخانەکەدایە ؟ لەملاولایدا ؟ )) .

((بەڵێ ، ژمارەیەک سەربازی لێیە . سێتی ڕەشیان لەبەردایـە ، ڕەش بەسەر شانەی زەردەوە ... لەگەڵ شـەرابە دا ... کـڵاوی ڕەشـی یـەک جۆر ... شتێکی نوک تیژو زەردی پێوەیـە ... بەسـەر کڵاوەکـەوە ... وە حەمایلێکی سوری بەدەوری کەمەر )) .

(( ئەو سەربازانە لەدەوورتن ؟ )) .

«ڕەنگە دووان یان سیانیان» .

(( تۆ لەوێی ؟ )) .

« لەجێیەکم ، لەناو بالأخانەکەدا نیم بەلأم لەو نزیکانەم » .

((سەیری دەورو بەرت بکەو بزانە دەتوانی خۆت بدۆزیەوە . چیاکان لەوبەرن ، وەگژوگیاو سەوزایی ... بالأخانەی سپی . بالأخانەی تر لەویادا هەن ؟ )) .

« ئەگەر لێشیبێ لەنزیکی ئەمدا نین . بالأخانەیەك ئەبینم ... جیا لە هەمووان ، دیوارێ لەپشتیەوە دروستکراوە ... دیوارێك » .

(( پێت و[illegible] بالأخانەیە ، یا تەپۆڵکەیە ، گرتوو خانەیە یا شتێ لەو بابەتە بێ ؟)) .

«پێدەچی [illegible]بێ بەلأم ... زۆر جیاوازە » .

(( بۆچی ئەو بالأخانەیە سەرنجی ڕاکێشاوی ؟ )) (وەستانێکی [illegible]) .

(( ئایا ناوی شار یا ئەو وڵاتەی تیایدای دەزانی ؟ ئەو شوێنەی کەسەربازەکانی لێیە ؟ )) .

« لام وایە ناوی "ئۆکراین" بێ » .

(( قۆناغە سەیرو جۆراو جۆرەکانی ژیانی سەرنجمی گرتبوو دووبارەم کردەوە : ((ئۆکرایت ؟ ئایا بەراوردێك ئەبینی ؟ هیچ دێتە بەرچاوت ؟ یان قۆناغێك لەزەمەن و شتێ لەو بابەتە ؟ )) بە دوودڵی وەلأمی داوە : «١٧١٧» ، پاشان ڕاستی کردەوە : «١٧٥٨» ... سەربازانی زۆری لێیە . نازانم ئامانجیان چییە . شمشێریان پێیە درێژو قەوس » .

پرسیم : ((هیچی تر ئەبینی یان ئەبیستی ؟ )) .

« سەرچاوەیەك ئەبینم ، جێیەکە ئەسپەکانی تیا ئاو دەدەن » .

(( سەربازەکان سواری ئەسپ ئەبن ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( ئایا سەربازەکان بەناوێکی خوازراوەوە خۆیان ناناسێنن ؟ )) گوێی شلکرد .

« شت یوا نابیستم » .

(( تۆ لەناویانداى ؟ )) .

« نــەخێر » وەڵامــەکانی دیــسان منداڵانــەبوو ، کــورت و بــەزۆری یــەك برگەیی. ناچاربووم دوێنەرێکی باشیبم .

(( بەڵام تۆ ئەوان لەو ناوەدا ئەبینی ؟)) .

« بەڵێ » .

(( تۆ لەشارداى )) .

« بەڵێ » .

(( هەرلەوێ دەژیت ؟ )) .

« پێم وابێ » .

((باشە بزانە ئەتوانی خۆت و جێگەیە کەتیایدای بدۆزیتەوە )) .

« هەندێ کــەل و پــەلی دڕاو لــەوناوەدا ئــەبینم . تــەنها یــەك منــاڵ ئەبینم. کوڕێکی مناڵەو جلەکانی دڕاون . زۆر سەرمایەتی ... » .

(( لەو شارەدا خانووت هەیە ؟ )) وەستانێکی زۆر .

« نــابینم » وادیــاربوو پەیوەنـدیکردن بـەم ژیانەیـەوە گرفتـی تیـابێ ، وەڵامەکانی بەدوودڵی و نادڵنیاییەوە بوو .

((ئەی ناوی کوڕەکە ئەزانی ؟ )) .

« نەخێر » .

((چی بەسەر دێ ؟ لەگەڵیا بڕۆو بزانە چی بەسەر دێ )) .

« ئەو کەسەی کە دەیناسێ زیندانیە » .

(( ناسراویەتی یان یەکێ لە خزمانی ؟ ))

وەلامەکانی کورت بوون : « لام وایە باوکی بێت » .

((تۆ ئەو کوڕەیت ؟ )) .

« دڵنیا نیم » .

(( ئەزانی لەبارەی زیندانی بوونی باوکییەوە هەست بەچی دەکات ؟ )).

« بەڵێ ... زۆر ئەترسێ ، لەوە ئەترسێ بیکوژن » .

(( باوکی چیکردووە ؟ )) .

«شتی لەسەربازەکان دزیوە . هەندێ نوسراو و بەڵگەنامەو لەو بابەتانە » .

(( ئەو کوڕە زۆر نافامێ ؟ )) .

« نەخێر ، ڕەنگە ئیتر باوکی نەبینێتەوە » .

(( تەنانەت بۆ دواجاریش باوکی نابینێت ؟)) .

« نەخێر » .

(( ئەوان ئەیزانن تا کەی زیندان دەبێ ؟ یان تاکەی دەمێنێ ؟ )) .

« نەخێر . » دەنگی لەرزی . زۆر نیگەران و نائاسوودە بوو . جوزئیاتەکانی نەدەوت سەرباری ئەمەش هەستم دەکرد لەو شتانەی کە ئەیبینین شڵەژابوو .

(( ئەتوانیت بزانیت ئەم کوڕە هەست بەچی دەکات ؟)) لەگەڵ ئەوەشا وتم (( هەست بەترس و نیگەرانیەك دەکەیت ؟))

« بەڵێ » دووبارە بێدەنگ بوو .

((چی دەقەومێ ؟ زەمەن تێپەڕێنە ، دەزانم دژوارە بەلأم برۆ . شتێك دەقەومێ ؟ )) .

« باوکی لەسێدارە دەدرێ » .

(( ئێستە هەستی چۆنە ؟)) .

« ئەمە بەهۆی کارێکەوەیە کە لەژیانیدا ئەنجامی نەداوە . بەلأم ئەوان بەبێ هیچ تاوانێ خەڵکی لەسێدارە دەدەن » .

((دەبێ ئەم کوڕە بەهۆی ئەمەوە زۆر بێتاقەت بێت )) .

« هەست ناکەم بفامێ ... چی قەوماوە » .

(( کەسیتر هەیە بچێ بۆلای ئەوان ؟ )) .

« بەڵێ ، بەلأم ژیانی پڕ چەرمەسەری دەبێ » .

(( چی بەسەر ئەو کوڕەدادێت ؟ )) .

«نازانم ، ڕەنگە بمرێ ... » زۆر غەمبار دیار بوو . دووبارە بێدەنگ بوو. پاشان سەیری ئەملاولای دەکرد .

(( چی ئەبینی ؟ )) .

«دەستێك ئەبینم ... دەستێ کەبەدەوری شتێکا دەبەسرێتەوە ... سپی . نازانم ئەمە چییە؟ ... » دووبارە بێدەنگ بوو، وەچەند خولەکێ تێپەڕی .

پرسیم : (( چیتر ئەبینی ؟)) .

« هیچ شتێ ... تاریکی . » یا مردبوو یان هەر چۆن بووبێ پەیوەندی بچڕابوو لەگەڵ کوڕێك کە زیاتر لە ٢٠٠ساڵ لەوە بەر لە ئۆکراین دەژیا .

((دەست بەرداری ئەو کوڕە بوویت ؟ )) .

« بەڵێ » لەپشوودانابوو .

(( لـەو قۆناغانـە چـی فێـر بویـت؟ بۆچـی ئـەو قۆناغـە بەلاتـەوە گـرنگ بوو؟)) .

«نابێ دەربارەی خەڵکی بەپەلـە دادوەری بکـەین . پێویـستە لەگـەڵ خەڵکیدا دادپەروەر بین . زۆرێك لەژیانەكان لەسـەرنجامی هەڵـە داوان و پەلە پەلكردنمانەوە لەناو دەچن » .

((ژیانی ئەو كورە بەهۆی ئـە و دادوەرییـە ... بەسـەر باوكیـدا ، دژوارو كورت بوو )) .

« بەڵێ » دووبارە بێدەنگ بوو .

((هیچیتر دەبینی یا دەبیستی ؟ )) .

« نەخێر» دووبارە وەڵامی كورت و پاشان بێـدەنگی . ڕێنومـایم كـرد تـا پشوویدات .

(( پشـوبە ، هەست بە ئاسوودەیی بکە . لاشەت خۆی تیمـار دەكـات ، ڕۆحت لەحەوانەوەدایە ... باشتری ؟ ئاسـوودەبووی؟ مایـەی چەرمەسـەری بوو بۆئـەو كـوڕە بچوكە ، بـەڵام ئێستە دووبـارە خـەریكی پـشوو دانیـت . زەینـت لەتوانایدایـە تۆبـەرێ بـۆ شـوێنەكانی دی ، زەمەنـەكانی دی و ... یاداشتەكانی تر ببات . لەپشوو داندایت؟ )) .

« بەڵێ » بڕیارمدا بەدوای ئەو خەوبینینەیدا بچم كەخانوەكـەیان ئـاگری گرتبوو وە كاردانەوەكانی باوكیو ناردنی ئەو بۆناو كڵپەی ئاگرەكە .

(( ئێستە لەبارەی خـەوێ كـە ... بەباوكتـەوە بینیـت پرسـیار دەكـەم . ئەتوانی بیرتی بێنیتەوە ، سامناك نیە ، تۆ لەخەواندنێكی قوڵدای . بـەبیرت دێ ؟ )) .

«بەڵێ » .

((گەڕایتەوە بۆ خانووەکە تا شتێك بێنی . لە بیرتە ؟ )) .

« بەڵێ ... سنوقێکی کانزا » .

(( ناو سنوقەکە چی تیابوو وا تۆی ناردە ناو خانوەکەوە لەساتی کڵپەسەندنا ؟ )) .

«پول و سکەکانی تیابوو ... ئەوانەی کە هەڵی ئەگرتن . » لەژێر هینپۆتیزمداو بیرهێنانەوەی خەو زۆر جیاواز بوو لەچاو بێداریا .

(( پول و سکەکانی لەلای ئەو زۆر بەنرخترن ؟ )) .

«بەڵێ » .

« ئەی خستنە مەترسی تۆو ناردنت بۆ ناو خانویەکە لەسوتاندایە ، وەبەتایبەتیش لەبەر پول و سکە ... » قسەکەمی بڕی . (( وای نەدەزانی ژیانی من ئەخاتە مەترسیەوە )) .

((لای وابوو ... مەترسیە ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( ئەی بۆچی لەبری ئەوەی تۆ بنێرێ خۆی نەچوو ؟ )) .

« چونکە لای وابوو من دەست و بردم زیاترە » .

(( ئەزانم ، بەڵام هەرچۆن بێ بۆ تۆش پڕ مەترسی بوو ؟ )) .

« بەڵێ ، بەڵام ئەو ئەمەی دیاری نەدەکرد » .

((ئەم خەوە لای تۆ مانای تری هەیە ؟ واتە لەپەیوەندی بە باوکتەوە ؟)) .

« نازانم » .

(( وادیارە بۆ چونە دەرەوە لە خانوەکە لەکاتی سوتانا هێندە پەلەی نەکردبێ )) .

« بەڵێ » .

(( بوچی پەلەی نەکرد ؟ تۆ زۆر بەدەست و برد بووی هەستت بەمەترسی دەکرد )) .

« چونکە ئەو خۆی هەوڵئەدات خۆی لەکێشەکان دەرباز بکات . » سودم لەمەوەرگرت تا بەشێ لەخەوەکەی بۆ لێکبەمەوە .

((بەڵێ ئەو هەمیشە هەر وابووە ، وە تۆ کاری زۆری بۆ دەکەی ، وەکو هێنانی سنوقەکە . هیوادارم لەتۆوە فێربێن . پێموایە ئاگر بەیانگری زەمەنێکە ڕوو لەکۆتابوونە ، وەئەمەش کەتۆ هەست بەمەترسی دەکەیت و ئەو نایکات و بگرە پشتگوێشی دەخات و تۆ دەنێری بەدوای مادیاتدا نیشانەی ئەوەیە کەتۆ زۆر زیاتر دەزانی ... هەروەها وانەی زۆرت لایە بۆ فێرکردنی ئەو ، بەلأم وای نابینم ئەو بیەوێ فێر بێت )) .

کاترین بەمە ڕازی بوو : « نەخێر ، وانازانم » .

(( من وا لەم خەوە دەگەم کەتۆ ناتوانیت ناچاریکەیت ، ئەو خۆی دەبێ ئەمە بزانێ و دەستنیشانی بکات )) .

« وایە » ئەو دووبارە ڕازی بوو ، وەدەنگی هێواشترو خەشن بوو . «ئەگەر پێویستمان بەلاشەمان نەبێت و لێمان زیاد بێت ، ئەوسا گرنگ نیە لەناو ئاگردا بسوتێین ... » .

ئەم ڕستەیە بەیانگری دیدگایەکی تەواو جیاوازی ڕۆحێك بوو دەربارەی ئەو خەوە . لەهاتنی کتوپڕی ئەو سەرسام بووم، توانیم تەنها ئەو ڕستە دووبارە بکەمەوە .

(( پێویستمان بە لاشەمان نەبێت ؟ )) .

«ئەخێر . لێرە قۆناغی زۆر دەبڕین . ئێمە لاشەی ساوایی وەلا دەنێین و دەچینە لاشـەی منداڵـەوە . لەوێـشەوە دەچـینە لاشـەی باڵغـەوەو پـاش وەلانانی لاشەی باڵغ دەچینە پلەی ڕۆحەوە . ئەمـە کارێکـە کـە ئـەنجامی دەدەین . قۆناغە جیاکانی گەشەی ئێمە ڕاناوەستێو بـەردەوام دەبێـت . وەختێ دەگەینە پلەی ڕۆح هـەر بـەردەوامین لـە گەشـەکردنمان . ئێمـە قۆناغی جیاوازی گەشەکردن ئەبڕین . وەختێ کەدەگەین بە جیهـانی ڕۆح هێزمـان تـەواو بـوبێ . ئێمـە دەبـێ قۆنـاغی نـوێ بونـەوەو فێربـون و بڕیاردانیش بگوزەرێنین . هەنـدێک هەڵیئەبـژێرن بگەڕێنـەوە . ئەوانـە قۆناغێکی دی لەپێشکەوتن تێئەپەڕێنن و هـەر بـە ڕۆحـی دەمێننـەوە ... هەنـدێک زیـاتر لـەوانی دی ئەمێننـەوەو پاشـان دەگەڕێنـەوە . هـەموو ئەمانە قۆناغەکانی گەشەکردن و فێربوونە ... گەشـەی بـەردەوام . کـە لێرەشین ، "شە وەکو ئالیەتێک وایە بۆ ئێمە. ئەوە ڕۆحمانـە کـە نـەمرو نەبڕاوەیە » .

ئـەو دەنـگ و شـێوازەی کـەدەدوا نـەم دەناسـی . ڕۆحێکـیتر دەدواو زانیاری نوێی دەگوت . مەیلم بوو پتر بزانم لەبارەی ڕۆحەوە .

(( فێربـوون لەلاشـەدا خێراتـرە ؟ بەڵگەیـەك هەیـە لەسـەر ئـەوەی کەخەڵکی بەڕۆحی نامێننەوە ؟ )) .

«ئەخێر . وەختێ کەڕۆحین فێربـوون زۆر خێراتـرو گـورج تـرە لەچـاو فێربوون لەلاشەدا . شتێ کەدەمانەوێ فێری بین هەڵی ئەبـژێرین . گـەر پێویستمان بێت بگەڕێینەوەو پەیوەندی کامڵ بکەین دەگەڕێینەوە . گـەر تەواومان کرد ئەوسا زیاتر پێشدەکەوین . کە لـە پلـەی ڕۆح دایـن گـەر بمانەوێ ئەتوانین پەیوەندی بکەین بەوکەسانەوەی کەلەلاشەدان . بـەڵام

ئەگەر گرنگ بێت ئەوسا ... گەر ناچار بین زانستێ بەوان بڵێین کە پێویست کات بیزانن » .

(( چۆن پەیوەندی دەکرێت ؟ ئەی چۆن پەیامەکان دەگەن ؟ ))

سەرسام بووم لەوەی کاترین وەڵامی داوە . لێدوانەکانی توندو خێراتر بوون .

«جار جارە ئەتوانی لەبەرامبەر خەڵکیدا دەرکەوی ... وەهەمان سەرو سیمات هەبێ کەلێرە بووتە . لەژانرەکانی ترەوە دەتوانی پەیوەندی زەینی دروست بکەیت . زۆر جار پەیامەکان نادیارو سڕین، بەڵام ئەو کەسە لەماناکانیان دەگات . دەزانێ مانایان چییە . ئەمەش پەیوەندییەکی زەینە بۆ زەین » .

بەکاترینم گوت : ((ئەو شتانەی ئێستە ئەیزانی ، ئەم داناییە کە زۆر گرنگ ... بۆچی لەبێداریا چنگت ناکەوێ ؟ )) .

«لەبێداریا توانای تێگەیشتنیانم نیە » .

((ڕەنگە من بتوانم فێرت بکەم تا تێبگەیت ، وەهاش کە نەتترسێنێ و فێریشی بیت )) .

«بەڵێ » .

((کەگوێت لەدەنگی ڕۆحە مەزنەکان دەبێت ، ئەوان هەر ئەو شتانە دەڵێن کەتۆ ئێستە بەمنی دەڵێی . وادیارە کەتۆ لەزانیارییەکی زۆردا هاوبەشیت ـولیای ئەو زانستەی ئەوبووم کەلەم دۆخەدا هەیبوو . تەنها وەڵامی داوە: «بەڵێ» .

(( ئەم زانیاریانە لەزەینی خۆنەوە دێن ؟ ))

« ئاخر ئەوان لە زەینما چاندوویانە . » کەوابوو ئیعتباری بە ڕۆحە مەزنەکان دەدا . منیش ڕازی بووم : ((ئەی باشترین ڕێگەیە بۆ گەڕاندنەوەی ئەم زانیاریانە بۆ لای تۆ، هەڵبەت بەو چەشنەی پەرە بسەنین و ترسەکانت نەمێنن چییە ؟ )) .

بەنەرمی وەلامیداوە : «تۆ بەر لەوە ئەم کارەت کردووە .» ڕاستی ئەکرد . ترسەکانی تا ئەندازەیەلەناو چووبوون و لەو کاتەوەی دەستمان دابووە هیپنۆتیزم زۆر پێشکەوتبوو .

((ئێستە پێویستە فێری چی وانەیەك بین ؟ گرنگترین ئەو وانەیە چییە کەدەتوانی لەماوەی ئەم قۆناغە لە ژیانتدا فێری ببین تابتوانی بەردەوام بیت لە پەرەسەندنت ؟ )) .

بەگورجی وەلامی داوە : «متمانە کردن » خۆی دەیزانی ئامانجی سەرەکی چ یە . لەسەرسامی وەلامە خێراکەی دووبارەم کردەوە : ((متمانە کردن ؟ ))

«بەڵێ . پێویستە فێربم باوەڕم هەبێو متمانە بەخەڵك بکەم . بەلام من وانیم . وادەزانم هەمووان لەهەوڵی ئەوەدان تا گورزم لێبوەشێنن . ئەمەش بوەتە هۆکاری ئەوەی لەخەڵك و زۆر شوێن خۆم دوورخەمەوە کەنابێ لێیان دووربم . ئەمە جگە لەوەش هۆکاری ئەوەیە لای خەڵکانێکدا بم کەپێویستە دوورە پەرێز بم لێیان » .

هەست و تێڕوانینی لەوەختێ لەم بارەدابوو زۆر زۆر بوو . خاڵەلاوازەکان وتواناى خۆی دەزانی ، ئەشیزانی ئەو شتانەی کە پێویستی بە گرنگیدان و توێژینەوەیە کامانەن و باشی دەناسین کە دەبێ چ بکات تا بەرەو باشتریان بەرێ . بەلام کێشەکە لەمابوو کە دەبوو ئەم هەستانە بە

زەینی بە ئاگای بگات و لە بێداریا کاریان لەسەر بکات . تێڕوانینەکانی ناوازە بوون بەڵام بەس نەبوون بۆ خودی خۆیو گۆڕانی ژیانی ئێستەی .

پرسیم : ((پێویستە خۆت لەکێ دوورە پەرێز بگریت ؟ ))

**کەمێ وەستاو ((من لە "بیکی" دەترسم . لە "ئیشتوارت" دەترسم ... زیانم پێبگەیەنن )) .**

((ئەتوانی خۆتیان لێ دوور بگری ؟ )) .

**((بەتەواوی نا ، بەڵام لەهەندێ ڕاو بۆچونیان بەڵێ . ئیشتوارت هەوڵ ئەدات من زیندانی بکات و خەریکە بۆشی ئەچێتە سەر . خۆیشی ئەزانێ کەدەترسم لەو دووربم و ئەویش بۆ هێشتنەوەی من لەلای خۆی سوود لەم چەکە وەردەگرێ )) .**

((ئەی بیکی ؟ )) .

**((ئەو بەردەوام لەهەوڵی ئەوایە ، 'وەرم بەو کەسانەی کەمتمانەم پێیانە لەناو بەرێ . ئەو شتەی من چاکەی تیا بەدی دەکەم ئەو شەڕی تیا ئەبینێو هەوڵیش ئەدات تۆوی ئەوە لە زەینما بچێنێ . وەختە فێر دەبم بەخەڵکانێک کە پێویستە ... متمانە بکەم ، بەڵام ئەو من دوو دڵ دەکات بەرامبەریان . هەر ئەمەش گرفتە.. ئەوە . من ناتوانم مۆڵەت بەم ناچارم کات وەکو ئەو بیر بکەمەوە )) .**

کاترین گەیشتبوە ئەوەی ئەیتوانی کەم و کورتی سەرەکی (بیکی)و (ئیشتوارت) دیاری بکات .

پرسیم ((ئەتوانی متمانە بەکێ بکەیت ؟ بیر لەمە بکەوە . دەتوانی بەکێ متمانە بکەیت و لێیان نزیک بیتەوەو شتیان لێوە فێربیت ؟ ئەوانە کێن ؟)) .

لەژێر لێوەوە وتی : ((ئەتوانم متمانە بەتۆ بکەم .)) خۆم ئەمەم دەزانیو ئەشمزانی ئەو پێویستی بەوە هەیە زیاتر لەمە متمانەی بەخەڵکی دەوورو بەریشی هەبێت .

((بەڵێ دەتوانی . تۆ لە منەوە نزیکی ، بەلام پێویستە لەو کەسانەی تریش کەلە ژیانتدان ، نزیکتربی ، ئەوانەی کەزیاتر لەگەڵتابن . )) ئەمویست کاملێ و سەربەخۆ بێت و پشت بەمن نەبەستێ .

**((ئەتوانم متمانە بەخوشکەکەم بکەم ، بۆ خەڵکیتر، نازانم . تاسنورێ ئەتوانم متمانە بە ئیشتوارت بکەم . ئەو گرنگیم پێدەدات ، بەلام سەر لەگومە. لەسەر لەگومی خۆیا ، بەبێ ئەوەی هەست بکات گورزێکم لێدەوەشێنێ )) .**

((بەڵێ، وایە. ئەی خەڵکیتر هەیە بتوانی متمانەی پێبکەیت ؟ ))

وەلامی داوە : **((ئەتوانم متمانەش بە "ڕ. ڕت" بکەم )) ئەو یەکێکی** تربوو لەپزیشکانی نەخۆشخانە . دوو هاوڕێی باش بوون پێکەوە .

((ڕەنگە کەسانێکی تر هەبن سەردانیان بکەیت ... لە ئایندەدا ))

**هاوڕابووین : ((بەڵێ)) .**

ئایدە زانین لەبارەی داهاتووەوە ئێجگار فریو دەربوو . زانیاریەکانی دەربارەی ڕابردوو زۆر ووردو ڕاست بوون . ئەو ، لەڕێگەی ڕۆحە مەزنەکانەوە ڕاستیو شتی سڕیو تایبەتی دەزانی . ئەی ئایا دەیتوانی ڕوداوی داهاتوو بزانێ ؟ ئەگەر وابوو ئەی ئەمانتوانی لێیان ئاگادار بین ؟ هەزارەها پرسیار بەمێشکما دەهاتن و دەچوون .

(( ساتێ وەکو ئێستە ، پەیوەندی بە (ئاگایی پتر)ی خۆتەوە دەکەیت ، بەهەر توانایەکی تربێت لەمەیدانی ڕۆحدا چنگتدەکەوێت ؟ ئایا ئەستەم نییە بەلاتەوە لەداهاتوو بڕوانی ؟ کاری زۆرمان دەربارەی ڕابردوو ئەنجام داوە)).

**«ئەمە دەست دەدا ، بەڵام ئێستە شتێکی ئەوتۆ نابینم » .**

((ئیمکانی ئەمە هەیە ؟))

**«پێم وابێت ».**

((ئەتوانی بەبێ ئەوەی سڵبکەیتەوە ئەم کارە ئەنجام بدەیت ؟ ئەتوانی بچیتە ئایندەو هەندێ زانیاری کە مەترسی نەبێ لەسەرت بەدەست بێنی؟ ئەتوانی داهاتوو ببینی ؟))

وەڵامەکەی خێرابوو **«شتی وانابینم ، مۆڵەتی ئەم کارە نادەن .»** ئەمزانی مەبەستی لە ڕۆحە مەزنەکان بوو .

((لەدەوورو ،ەرتن؟)) .

**«بەڵێ»** .

((لەگەڵت دەدوێن )) .

**«نەخێر، ئەوان هەموو شتێ کۆنترۆڵ دەکەن»** لەحاڵێکداو کەدەکراو مۆڵەتی نەبوو تەماشای داهاتوو بکات ، پێنەدەچوو بمانتوانیبا لەڕوانین بۆ ئایندە سودێك وەربگرین . پێنەدەچوو ئەمە کاترینی زۆر نیگەران کردبێ . ڕەنگە هێشتا ئامادەیی دەرککردنی زانیاریەکی وەهامان نەبووبێ . مەسەلەکەم ڕەها کرد .

((ئەو ڕۆحەی کەبەر لەئێستە لە نزیکت بوو ، گیدیون ...)) .

**«بەڵێ»** .

((چی دەوێ ؟ بۆچی لە نزیك تۆدایە ؟ ئەیناسی ؟ )) .

«نەخێر. وا نازانم» .

((بەڵام ئەو تۆ لە مەترسیەكات دەپارێزێ )) .

«بەڵێ» .

((ئەی ڕۆحە مەزنەكان ... )) .

«نایانبینم» .

((زۆرجار ئەوان پەیامیان بۆمن هەیە ، هەڵبەت پەیامی وا كەیارمەتی هەردووكمان دەدات . ئایا ئەم پەیامانە ، وەختێ كەقسە ناكەن لەدەستی تۆدان ؟یان ئەوان ئەم فیكرانە دەخەنە ناو زەینتەوە ؟ )) .

«بەڵێ» .

((ئەی ئەوان چاودێری ئەوەشن كە تا چ ئاستێ پێشكەویت و بتوانی چ شتێك بەبیر بێنی ؟)) .

«بەڵێ» .

((كەوابوو لەباسكردنی ئەم قۆناغەی ژیاندا ئامانجێك شاراوەیە ...)) .

«بەڵێ» .

((... بۆهەردووكمان ... لەبەر فێربونمان ،یان لەناوبردنی ترس تیاماندا)) .

«ڕێگەی زۆرهەن بۆ پەیوەندیكردن . ئەوان زۆرێكیان دیاریدەكەن ... تا نیشانمان بدەن كە بوونیان ڕاستەقینەیە . »

((ئەزانی ئەوان بۆچی تۆیان دیاری كردووە ... )) .

«نەخێر » .

((... تا كەناڵێكی پەیوەندی بیت ؟ )) ئەمە پرسیارێكی وورد بوو ، چونكه ئەو لەبێداریا نەیدەتوانی تەنانەت گوێ لە كاسێتەكان بگرێ . بەنەرمی لەبەر خۆیەوە ووتی : ((نەخێر)) .

((ئەم مەسەلە دەتترسێنێ ؟ ))

((هەندێ جار)) .

((هەندێ جاری تریش ناتترسێنێ ؟ ))

((بەڵێ)) .

بۆم زیاد كرد : ((ئەمە دەبێتە هۆی هێزی دڵ . ئێستە ئێمە كەدەزانین نەمرین ، ترس لەمردن لەدەست دەدەیت )) .

((بەڵێ)) ماوەیە بێدەنگ بوو . دووبارە هاتەوە سەر فێركارییەكانی ژیانی ((من ، پێویستە فێربم متمانە بكەم ، كە شتێكم پێدەوترێ پێویستە فێربم ، ئەوەی ئەیبیستم متمانەی پێدەكەم ... ئەمە لەكاتێكدا ئەگەر ئەوكەسە دانابێت))

((خەڵكانێك هەن نابێ متمانەیان پێبكەیت )) .

((بەڵی . بەلاّم من ساویلكە بووم . ئەزانم پێویستە متمانە بە هەندێك بكەم بەلاّم بەپێچەوانەی ئەم هەستەوە دەجەنگم و لەمتمانەكردن سەرپێچی دەكەم )) ئەو بێدەنگ بوو وەمنیش دووبارە دەسخۆشیم لەدیدگاو ستەكەی كرد .

((دانیشتنی پێشوو لەبارەی منالّی تۆوە دواین ، وەختێ منالّ بووی لەباخێكی پڕ لەسێودا بووی . لەبیرتە ؟ زەماوەندی خوشكەكەت ؟ ))

((تا ڕادەیەك )) .

((ئایا ئەمانتوانی سودێكی زۆرتر لەو قۆناغە وەرگریت ؟ ئەیزانی ؟ ))

«بەڵێ» .

((ئەرزشی ئەوەی تیایە بگەڕێینەوەو تاوو توێی بکەین ؟)) .

«ئێستە ئەو قۆناغە ناگەڕێتەوە . شتی زۆر لەهەر قۆناغێکی ژیاندا هەیە ... لەهەر قۆناغێکی ژیاندا زانست و زانیاری زۆر بۆ وەچنگ هاتن هەیە ... بەڵێ ، پێویستە تاووتوێی بکەین، بەڵام ئێستە ناگەڕێتەوە» .

دووبارە گەڕامەوە بۆ پەیوەندییە ئاڵۆزو گرفتارەکانی ئەو لەگەڵ باوکی . ((پەیوەندی تۆو باوکت مەسەلەیەکی ترە ، مەسەلەیەکە لەم ژیانەتدا ئاسەواری لەسەر بەجێ هێشتویت )) .

تەنها وەڵامی داوە : «بەڵێ» .

((ئەمانە پێویستە پتر تاووتوێی بکەین . تۆ لەم پەیوەندیەوە زۆر شت فێربوویت . باوکت بەو کورە بچکۆلەی کەلە "تۆکراین" بوو باوکی لەتەمەنی سەرەتایدا لەدەستدا ، بەراورد بکە . ئەم جارە ئەو ڕوودارە نەقڵەوما . لەگەڵ ئەوەشدا هەبوونی باوکت ، گەرچی هەندێك لە نەهامەتیو چەرمەسەریەکان کەمتر بوون ... )) .

ئەو سەرەنجامی دەستکەوت : «بارێکی زۆرتر بووا» لەگەڵیشیا وتی «بیرو بۆچوونەکان ... بیرو بۆچوونەکان ... » .

هەستم کرد لەشوێنێکی نوێدا بوو : «چ بیرو بۆچونێ ؟» .

«دەربارەی بێهۆشی ، وەختێ کەسێ بێهۆش دەکەن ئایا توانای بیستنی هەیە ؟ ئا ، هەیەتی !» وەڵامی پرسیارەکەی خۆی داوە . بە خێرایی دەی وتەوەو حەماسیەت دەیگرت .

«زەینی مرۆڤ زۆر بەئاگایە لەوەی کە ڕوودەدات . ئەوان لەبارەی تاساندنی منەوە دەدوان ، دەربارەی ئەگەری تاسانم لەپاش ئەوەی گەروومیان نۆژداری کرد » .

نۆژداری ژێ دەنگییەکانی کاترینم هاتەوە بیر . ئەم نۆژداریە چەند مانگێ بەر لەیەکەم دیدارمان ئەنجام درابوو . بەر لەنۆژداریەکە نیگەران بوو وەساتی هۆش هاتنەوەی پاش نۆژداری تەواو هەراسان ببوو . چەند کاژێرێکی خایاندبوو تا پەرستیاران هێوریان کردبوەوە . وادیار بوو ئەوەی نۆژدارەکان لەکاتی نۆژداریکردنیا گوتبویان (لەکاتێکدا کەئەولە بێهۆشیەکی قووڵدا بووە) ببوە هۆی ترساندنی. ئەو قسە باوانەی لەکاتی نۆژداری دەکرێن هێنامنەوە بیری خۆم . وەختێ نەخۆشەکان بەنج دەیانگرێ و بێهۆش دەبن نۆژدارەکان گاڵتەو جنێوو قسەو تورە بونەکانیان دەردەبڕن . نەخۆشەکان کەبێهۆش دەبن چ شتانێك دەبیستن ؟ ئەم شتانە تا چەند دەتوانێ ئاسەواری بەسەر بیرکردنەوەو هەست و ترس و نیگەرانیەکانیان هەبێ لەپاش بێداری ؟ ئایا قۆناغی دوای نۆژداری و بەهۆش هاتنەوەی نەخۆش ، ئاسەواری قسەکانی کاتی نۆژداری نەبوو . ئایا کەس بەهۆی پێشبینیە خراپەکانەوە لەساتی نۆژداریا نەمردبوو ؟ ئایا نەخۆشەکان بەهۆی هەستکردن بەنائومێدیەوە ئەسیری مەرگ نەبووبوون ؟
پرسیم : ((لەبیرتە چیان دەگوت ؟)) .

«بۆ نوژداریەکەم ناچار بوون سۆندەیە ڕەوانەی هەناوم بکەن ، وە دەگونجا لەکاتی هێنانە دەرەوەیدا قوڕگم زیانی پێبگات . نەیان ئەزانی کەمن دەتوانم لەقسەکانیان بگەم » .

((وەبەڵام بیستت)) .

«بەڵێ ، هەرلەبەر ئەوە بوو ئەو گرفتانەم هەبوو» لەپاش ئەم دانیشتنە چی دی کاترین ترسی نەما لەقوتدان و خنکان، هەر بەم سانایيە چاك بوو . ئەو بەردەوام بوو : «ئەو هەموو نیگەرانییە ... وام ئەزانی ئەتاسێم » .

پرسم : ((هەست بەدەربازبوون دەکەیت ؟)) .

«بەڵێ ، تۆ ئەتوانیت ئاسەواری ئەو کارەی ئەوان ئەنجامیان دا نەهێڵیت» .

((دەتوانم)) .

«بەڵێ ، تۆ خەریکی ئەنجام دانیتی ... پزیشکان ئەبێ ئاگاداری ئەوەبن کەدەیڵێن . ئێستە من ئەوەم لەبیرە . سۆندەیەکیان لەگەروم دانا . پاش ئەوە نەمدەتوانی قسەیە بکەم یان شتێ بڵێم » .

((ئێستە تۆ ئازادی ... تۆ قسەی ئەوانت بیست )) .

«بەڵێ قسەکانیانم بیست ... » بۆماوەی یەك دوو خولەکێك بێدەنگ بوو ، پاشان سەری بەملاولا سوڕاند . وادیاربوو گوێ لە شتێ دەگرێ .

((هەستەکەم پەیام ئەبیستێ. ئەزانی پەیامەکان لەکوێوە دێن ؟ ))

ئومێدەوار بووم ڕۆحە مەزنەکان دەرکەون .

وەلامەکەی ناڕون بوو : «کەسێ پێی گوتم » .

((کەس دواندیتی ؟)) .

«بەلأم ڕۆشت» هەولّم دا بیانگێڕمەوە .

((بزانە ئەتوانی ڕۆحەکان بگێڕیەوە بۆ پەیامەکان بۆ ئێمە ... تا یارمەتیمان بەن)) .

بەبچڕبچڕی وتی : ((ئەوان کاتێک دێن خۆیان خوازیاربن ، نەك هەرکاتێ کەمن بمەوێ)) .

((تۆ هیچ دەستەلأتێکت بەسەر ئەم کارەدا نییە ؟)) .

((نەخێر)) .

((باشە ، بەلأم ئەو پەیامەی پەیوەندی بە بێهۆشیەوە هەبوو بەلاتەوە زۆر گرنگ بوو ، لەبەر ئەوەبوو ئەبووە هۆی ئەوەی هەست بەتاسان بکەیت)).

وەلأمی داوە : ((بۆ تۆ گرنگ بوو نەك بۆ من)) وەلأمەکەی لە زەینما زرینگایەوە . ئەو ترسی تاساندنی تیمارکرا کەچی دەرخستنی ئەم نهێنیە زیاتر بۆ من گرنگ بوو تا ئەو . من پزیشکێکی چارەسەرکردن بووم . وەلأمە سادەکەی ئەو چەمکی فراوانی بەدەمەوە بوو ، ئەگەر لەهەموو ئەم چەمکانە بگەشتابام ئەمتوانی بزوتنەوەیەک . (کوانتومی)م لە دەرك و پەیوەندی مرۆڤایەتیم هەبێت . پێدەچێ یارمەتی دان گرنگتر بێت لە دەرمان !

پرسیم : ((بۆ من هەتا یارماتی تۆی پێبەم ؟)) .

((بەڵێ ، تۆ ئەتوانی قەرەبووی هەڵەی ئەوان بکەیتەوە . تۆ لەساتی قەرەبوو کردنەوەی هەڵەکانی ئەواندا بوویت ...)) ئەو پشوی دەدا . هەردوومان وانەیەکی گەورەمان خوێندبوو .

*                    *                    *

کەمێك پاش جەژنی لەدایك بونی سێ ساڵەی کچەکەم (ئیمی) بەڕاکردن بەرەو ڕووم هات و باوەشی کرد بەقاچما . تەماشایەکی سەرەوەی کردوو

گـــوتی : ((بابـــه ، چـــل هـــەزار ســـاڵە خۆشـــم ئـــەوێی )) لەدەمووچـــاوە وردیلانەکەیم دەڕوانی و هەستم کرد زۆر زۆر خۆشحاڵم .

چەند شەویَ دوای ئەوە ، بەڕاچڵەکینێکی گەورە لەخەوێکی قولَ خەبەرم بووەوە . دەم و چاوی کاترین هاتە بەرچاوم لەدۆخێکی نالەباردا . ناڕەحەت دیاربوو ، دیاربوو پێویستی بە یارمەتی من هەبوو . تەماشای کاژێرەکەم کرد ٣:٣٦ خولەکی بەیان بوو. هیچ دەنگێك لەدەرەوە منی خەبەرنەکردەوە . کارول لەلاما نوستبوو . ئەمەم لەزەینم دەرناو دووبارە نوستمەوە.

کاژمێر ٣:٣٠ خولەکی هەمان وەخت ، کاترین لەکابوسیَ لەخەو خەبەری بوویەوە . عارەقی کردبوو وە دڵی بەپەلە لێی دەدا . بۆ هێورکردنەوەی خۆی بڕیاری دابوو مەتدیتەیشن بکات ڕای دانابوو کەلەعیاداکەمەو هیپنۆتیزم ئەکەین و دەم و چاوی منی هێنابووە بەرچاو ، دەنگمی دەبیست و چووە خەو .

توانا ڕۆحیەکانی کاترین ڕۆژ بەڕۆژ پتر دەبوون و منیش هەروەها . ئەمتوانی دەنگی مامۆستایانی دەروونیم کە دەربارەی پەرچەکردارەکانی (گواستنەوەو دژە گواستنەوە) کە لەبارەی چارەسەرکردنەوە دەدوان ببیستم . گواستنەوە ، پلان دانان ، ئیحساسات و فیکرو مەیلی نەخۆش بۆپزیشکەک ی خۆیەتی وپزیشك بەیانگری ئەوکەسایەتییە کەلە ڕابردووی نەخۆشدا هەبووە . دژە گواستنەوە بەپێچەوانەوەیە . واتە پەرچەکردارە

ئیحساسیەكان و نائاگایی پزیشك بە ئاراستەی نەخۆش . بەلام ئەو پەیوەندییەی كاژێر ٢:٣٠ خولەكی بەیان دروست بوو هیچ كام لەمانە نەبوو. ئەمە پەیوەندییەكی ڕۆحی و مەعنەوی بوو . هیپنۆتیزم بووبووە هۆی كردنەوەی ئەم كەناڵە . ئایا دەكرا بڵێین چاودێران و گروپە جیاكانی ڕۆحە مەزنەكان پارێزەر بوون و خەڵكی بەرپرسی ئەفراندنی ئەم شەپۆلە درێژە بووبێت ؟ كارەكانم لەسەر سوڕمانیش تێپەڕیبوون.

لەدانیشتنی دواتردا ، كاترین بەزویی چووە خەوانەنێكی قوڵەوە . كتوپڕ نیگەران بوو . «هەورێكی گەورە ئەبینم ... ترساندمی ، لەوێ بوو .» بەپەلە هەناسەی ئەدا .

((هێشتا هەر لەوێیە ؟)) .

«نازانم . زوو هاتوو ڕۆی ... شتێك لەو بەرزاییەوە ، بەسەر چیایەكەوە » . هەروا نیگەران بوو بەسەختی هەناسەی دەدا. ئەترسام لەوەی بۆمبی بینیبێ . ئایا ئەیتوانی ئاینده ببینێ ؟

((ئەتوانی باش ببینی ؟ وەكو بۆمبە ؟)) .

«نازانم» .

((بۆچی ترساندیتی ؟)) .

«زۆر كتوپڕی بوو ، یەكسەر دەركەوت ، پڕدووكەڵ بوو ... دووكەڵی زۆر . گەورەش بوو . مەوداكەشی دوور بوو».

((مەترسی نییە لەسەرت ، ئەتوانی لێی نزیك بیتەوە ؟ )) .

بەتوندی وەڵامی داوە : «نامەوێ لێی نزیكتربم !» جاران هێندە ڕێگری نەدەكرد .

دووبارە پرسیم : ((بۆچی ئەوەندە لێی ئەترسی ؟ )) .

«لام وایه مادەیەکی کیمیایی یان شتێکی وەك ئەوە بێ . هەناسـەدان لەو دەوروبەرەدا دژوارە . » کاترین بەقورسی هەناسەی دەدا .

((لەئاغاز ئەچێ ؟ لەناو چیاکەوە دێتەدەر ... وەکو گڕکان ؟)) .

«پێم وابێ وایە . لەقارچکێکی گـەورە ئەچـێ . قارچـك ... قارچـکێکی سپی » .

((خۆ بۆمب نییە؟ بۆمبی ئەتۆمی یان شتێتر ؟)) کەمێ وەستاو پاشـان بەردەوام بوو .

«ئاگرە ... وادەزانم گڕکان یان شتێکی وەك ئەوبێ . زۆر سـامناکە . هەناسەت بۆ ناردێ . پڕلە گەردو خۆڵە . نامـەوێ لـەوێبم . » وردە وردە هاتەوە سەر هەناسە قوڵەکانی دۆخی هیپنـۆتیزم . ئـەو دیمەنـە سـامناکەی وەلانابوو .

((ئێستە هەناسەدانت باشترە ؟ )) .

«بەڵێ » .

((چی ئەبینی ؟ )) .

«هیچ ... ملوانکەیـە ئـەبینم بـەملی کەسێکەوە ، شـینە ... زیویـەو یاقوتێکی شینی پێوەیەو پاشان مرواری بچوکتریشی پێوەیە » .

((هیچشتێ بەسەریاقوتە شینەکەوەیە ؟)) .

«نەخێر ، تەنك و ناسکە . ئەودیوی دیارە . ئەو خاتوونە قژی ڕەشـەو کڵاوی شینی بەسەرەوەیە ... جلەکانی نەرمن».

((ئەو خاتوونە دەناسی ؟ ))

«نەخێر» .

((تۆلەوێی یان تۆ ئەو خاتونەی ؟ )) .

«نازانم» .

((خۆ ئەیبینی ؟))

«بەڵێ ، من ئەونیم» .

((تەمەنی چەندە ؟ )) .

«نزیکەی چل ساڵ ، بەڵام پیرتر لەتەمەنی دیارە» .

((خەریکی ئەنجامدامی کارێکە ؟ ))

«نەخێر، لەلای مێزێکدا وەستاوە. شوشەیە عەتر لەسەر مێزەکەیە . سپیەو گوڵی سەوزی لەسەرە . شانەیەکیشی لێیە» کەوتمە ژێر کاریگەری چاوە تیژەکانیەوە .

((لەژوورەکەیدایە یان لە دوکاندا ؟ )) .

«ژوورەکەیەتی ، تەختەیەکی چوار قاچی قاوەیی لێرەیە . سوراحیەکی گەورەی مس لەسەر مێزەکەیە» .

((سوراحی گەورە ؟ )) .

«بەڵێ ، هیچ وێنەیە لە ژوورەکەدا نیە . پەردەی ڕەش و سەیر سەیر هەن» .

((کەسیتر لەو ناوەدا هەیە )) .

«نەخێر» .

((ئەو خاتوونە چی تۆیە ؟ )) .

«من خزمەتکاریمی» .

((ماوەیەکی زۆر لەگەڵیا بووی ؟)) .

«نەخێر ... چەند مانگێکە» .

((حەزت لەو ملوانکەیەیە ؟)) .

«بەڵێ ، خاتوون زۆر کەشخەیە » .

((تا ئێستا ئەو ملوانکەیەت کردۆتە مل ؟)) .

«نەخێر» وەڵامەکانی کورت بوون و پێویستی بەڕێنومایی و بزواندنی من هەبوو تابتوانم زانیاری زیاتر چنگ خەم . ئەیخستمەوە بیری کوڕە نەوجوانەکە .

((چەند ساڵانی )) .

«ڕەنگە سیازدە یان چواردە ... » .

پرسیم : ((بۆچی لای ماڵەوە نین ؟ )) .

«لای ئەوان نیم ، بەڵام لەوێ کار دەکەم » .

((پاش تەواو بوونی کار دەچیتەوە بۆ ماڵەوە ؟ ))

«بەڵێ» وەڵامەکانی منی نەدەگەیاندە هیچ کوێ .

((هەر لەو نزیکانەدا ئەژێت ؟ )) .

«ئاڕادەیە نزیکە ... ئێمە زۆر هەژارین ... پێویستە کار بکەین ... خزمەت بکەین » .

((ناوی خاتوون دەزانی ؟ )) .

«بیلندا » .

((لەگەڵت باشە )) .

«بەڵێ» .

((ئەی ئیش زۆر دەکەیت ؟ )) .

«زۆر ماندوو هێنەرو دژوارنییە » دواندنی نەوجەوانان هەرگیز کارێکی سانا نەبووە تەنانەت لەژیانەکانی پێشووشدا . لەم بارەوە لێهاتوو بووم .

((هێشتا هەر ئەیبینی ؟)) .

**«نەخێر» .**

**((ئێستە لەکوێی ؟ )) .**

**«لەژوورێکی تـرم ، مێزێکـی لێیــە بەڕووکەشـی ڕەش داپۆشـراوە ... بۆنی گژوگیای بۆنداری لێدێ ... بۆنی توند » .**

**((گشت ئەمانە هی خاتونەکەی تۆیە ؟ وادیارە عەترو شـت زۆر لـەخۆی دەدات ؟ )) .**

**«نەخێر ئێرە ژوورێکی کەیە . لەژوورێکی تردام)) .**

**((ئەم ژوورە هی کێیە ؟ )) .**

**«ژووری خانمێکی ڕەش پێستە » .**

**((چۆن ؟ ئەتوانی ببینی ؟ )) .**

**لەژێر لێوەوە وتی : «سەرپۆشی زۆری داوە بەسەریا ، شاڵی زۆریش . ئەو پیرو پەککەوتەیە » .**

**((تۆ چی ئەویت ؟ )) .**

**«تەنها چووم ببینم » .**

**((بۆچی ؟)) .**

**«بۆئەوەی بەختم بۆبگرێتەوە »** تێگەیـشتم کەچـووبووە لای فـاڵگیرێ . فاڵگیرێ کەبەختی بۆ دەگرتەوە . تەنز ئامێز بوو . لەو ساتەدا من و کـاترین دەرگیری ڕووداوێکی سەیر بووین ، ڕەهەنـدو قۆناغـە جیاوازەکـانی ژیانمـان تەیدەکرد ، ئەمە لەکاتێکدا کە ڕەنگـە دوو سـەد سـاڵ بـەر لەئێـستە بـووبێ کاترین چوو بووە لای فاڵگیر تا لەداهاتووی ئاگاریکەن . ئەمزانی کـاترین لـە ژیانی ئێستەیدا نەچوەتە لای هیچ فاڵگرێك و هـیچ زانیاریـەکی نیـە لـەبارەی بەخت و داهاتووەوە . ئەم شتانە ئەو یان دەترساند .

((ئەو ژنە بەختدەگرێتەوە "داهاتوو بینە" ؟ ))

«ئەو شتی زۆر دەبینیێ » .

((پرسیارت هەیە لێی ؟ ئەتەویێ چی ببینی ؟ چی شتیێ بزانی ؟ )) .

«دەربارەی پیاویێ ... ڕەنگە شووی پیبکەم » .

((کەداهاتو دەبینیێ چی دەڵیێ ؟ )) .

«کارتیێ ... دارێک لەسەریەتی . دارگوڵە ... کارتیێ کە جامێکی لەسەرە فنجانێکیش ... کارتیێ دەبینم بەوێنەی پیاویێ گۆچانی بەدەستەوەیە . ئەو دەڵیێ من شوو ئەکەم ، بەڵام بەم پیاوە نا ... هیچیتر نابینم » .

((خاتوون دەبینی ؟ )) .

«هەندیێ سکە دەبینم » .

((هێشتا لەگەڵیدای یان [illegible]ڕێنیێ تری ؟ )) .

«نەگەڵیام » .

((سکەکان چۆنین ؟)) .

«ئاڵتونن ، لێوارەکانیان ساف نیە ، شێوەیان چوارگۆشەیە . دیوێکیان تاجی لەسەرە » .

((بزانە بەرواریێ وشەیەك شتیێ هەیە لەسەر سکەکان بیخوێنێتەوە...)).

«ژمارەی بیانی ... * و ا کانی لەسەرە » .

((ئەزانی ساڵی چەندە ؟ )) .

«هەزارو حەوسەد ... نازانم کەیە. » دووبارە بێدەنگ بوو .

بۆچی ئەم فاڵچییە گرنگە بەلاتەوە ؟ )) .

«نازانم » .

((ئایا فاڵەکەی ڕاست دەرئەچێت ؟ )) .

((لەژێر لێوەوە وتی : ((ئەو ڕۆیشتوەو من نازانم )) .

((ئێستە هیچ ئەبینی ؟ )) .

((نەخێر )) .

((نەخێر ؟ )) سەرسام بووم . ئەو لەکوێ بوو ؟ پرسیم : ((ناوی خۆت ئەزانی ؟ )) بەهیوابووم لەم قۆناغی ژیانەی چەند ساڵی پێشوودا شتێ هەڵکرێنم .

((لەوێ نەماووم )) ئەو قۆناغەشی بڕی بوو پشوی دەدا . لەمەولا بەبێ ئەزموونی مردنی بکات بەتەنها ئەیتوانی ئەم کارە بکات . چەند خولەکێك وەستام . ئەم ژیانەی پڕلەڕووداو نەبوو ، بەتەنها چەند دیمەنێکی باسکراوو دیدارێکی فالچی بەبیرهێنابوو .

دووبارە پرسیم : ((ئێستە هـ ـچ ئەبینی ؟ )) .

لەژێر لێوەوە وتی : ((نەخێر )) .

((لەپشوو دانای ؟ )) .

((بەڵێ ... گەوهەرەکان بەڕەنگی جیاواز ... )) .

((گەوهەر؟))

((بەڵێ ، لەشێوەی ڕووناکیدان بەڵام وەك گەوهەرن ... )) .

وتم : ((چیتر ؟ )) .

((من تەنها...)) وەستا ! پاشان دەنگی گەورەتر بوو: (( وشەو فیکری زۆر لەملاولامەوە دێن ودەچن ... ئەویش دەربارەی پێکەوە ژیانی و هەماهەنگی ... و هاوسەنگی شتەکانە . )) تێگەشتم کە ڕۆحە مەزنەکان لەوناوەدا بوون .

((ئەمەویٚ لەم بارەوە شت بزانم ، ئەتوانی بۆم بدوێی ؟))

وەلأمـی دایـەوە : ((پێکــەوە ژیــان و هەماهــەنگی )) ڕۆحـە شـاعیرەکە لأمی داوەو خولیای دووبارە بیستنی دەنگی بووم .

(( هەموو شتەکان دەبیٚ هاوسەنگی هەبێت . سروشـت هاوسـەنگە . ئاژەڵە دڕەندەکانیش بەهاوسەنگی ئەژین . بەڵام مرۆڤەکان فێر نەبوون ئەم کارە ئـەنجام بـەن . بـەردەوام خۆیـان لـەناو ئەبـەن . لەسروشـتدا شتەکان جیـاوازن . سروشـت هاوسـەنگە . سروشـت هێـزو ژیـان و ... گەڕانەوەشە بۆ دۆخی سەرەتای . مرۆڤەکان تـەنها وێرانکـاری دەکـەن . هەر ئەوانن سروشت خـاپور دەکـەن و مرۆڤـەکانی تـر لـەناو دەبـەن و دواجاریش خۆیان لەناو دەبەن )) .

ئەمە نوقڵانەیەکی خراپ بوو . لەکاتێکدا دونیا بەردەوام لەتاڵان بـڕی و ئاشوب دایە ، هیوادارە ئەمە بەزوویی نەقەومیٚ .

پرسیم : ((ئەمە کەی دەقەومیٚ ؟ )) .

((زۆر زووتــر لــەوەی بــیری لێدەکەنــەوە دەقــەومیٚ . سروشــت ئەمێنێتەوە . گیاکانیش ئەمێننەوە، بەڵام ئێمە نامێنین )) .

((بۆ بەرگرتن لەم کاولکاریە ، ئەتوانین شتیٚ بکەین ؟ )) .

((نەخێر ، هەموو شتیٚ پێویستە هاوسەنگی هەبێت ... )) .

((ئـەم وێرانیـە لـەم ژیانـەی ئێمـەدا دەقـەومیٚ ؟ ئایـا دەتـوانین دووری خەینەوە ؟ )) .

((لەم قۆناغەی ئێمەدا ناقەومیٚ ، کاتیٚ ئەمـە دەقـەومیٚ ، لەپلەیـەکی تردایین و لەڕەهەندێکی تر . بەڵام هەر ئەشیبینین)) .

((هیچ ڕێگایە نیە بۆ فێرکردنی مرۆڤەکان ؟ )) وەدووی ڕێگە چارەیەکدا بووم بەڵکو لەهێزی وێرانیەکە کەمکاتەوە .

**((ئەم کارە لەڕوویەکی ترەوە دەگونجێ و ئێمەش لێیەوە فێری شت دەبین )) .**

من لەڕوونی مەسەلەکەم دەڕوانی . ((دەی کەوابوو ڕۆح لەشوێنە جیاوازەکانی تریشدا پێشدەکەوێ )) .

**((بەڵێ . ئەوەندەی ئەزانین ئێمە چی دی ... لێرە نابین . بەڵام ئەوە دەبینین )) .**

(( بەڵێ من ئەمەوێ خەڵك فێرکەم ، بەلام نازانم چۆن چۆنی پەیوەندیان پێوە بکەم . ئایا ڕێگەیەك هەیە یان دەشێ خۆبەخۆ فێری بن؟)) .

**(( تۆناتوانیت پەیوەندی بەهەموانەوە بکەیت . لەپێناو بەگرتن لەوێرانی پێویستە پەیوەندی بەهەموانەوە بکەیت . ئەمەش لەتوانای تۆدا نیە . بەرلەمە ناگیرێ و ئەوانیش فێردەبن . وەختێ ڕۆحیان پێشکەوت فێردەبن . ئەو وەخت ئارامی و ئاسایشیان دەبێ بەڵام نەك لێرە ، نەك لێرەو لەم ڕەهەندەوە )) .**

(( وەدواجاریش چاکساز دەبێ ؟ )) .

**(( بەڵێ ، لەپلەیەکی تردا )) .**

((زۆر دوور دیارە . ئێستە خەڵك بیریان کورتە ... بەتەماع و ... تینووی هێزن . ئەوانە عەشق و لێکگەیشتن و زانستیان فەرامۆش کردوە . هێشتا ئەبێ فێری زۆر شت بن )) .

**((بەڵێ )) .**

(( ئـەتوانم لـەپێناو یارمـەتی دانـی خـەڵك شـتێ بنوسـم ؟ ڕێگـای تـر هەیە ؟)) .

« تۆ ڕێگە دەزانی و پێویست ناکات ئێمە پێتی بڵێین. سوودی نییە ، چونکە هەمووومان دەگەینە ئەوپلـەو ئەوانـە دەبیـنین . ئێمـە هـەمووومان یەکین و کەس لەکەس گەورەتر نیە . هەموو ئەم شتانە بـۆ فێرکـردن و ... ئاگادارکردنەوەیە» .

ڕازی بووم : ((بەڵێ )) ئەمە زانستێکی گشتگیر بوو لەپێناو دەرککردنی پێویـستم بەزەمـەن هـەبوو . کـاترین بێـدەنگ بووبـوو . وەسـتام، لەپـشوو دانابوو منیش بیرم لەگوتەکانی دەکردەوەو سەرنجمی ڕاکێشابوو . دواجـار بێدەنگی شکاند .

« گەوهـەرەکان ڕۆشـتن » . لەبەرخۆیـەوە گوتیـەوە : «گەوهـەرەکان ڕۆشتن ، نورەکان .. ئەوان ڕۆشتن » .

(( دەنگەکانیش ؟ ووشەکانیش ؟ )) .

« بەڵێ ، هیچ شتێ نابینم » . کەوەستا سەری دەسوڕان بەملاولادا .

« ڕۆحەکان ... تەماشام دەکەن » .

(( تەماشای تۆ ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( دەیناسی ؟ )) .

« دڵنیـا نـیم ... لام وایـە "ئیـدوارد" بێـت » ئیـدوارد سـاڵی ڕابـردوو مردبوو . ئەو لەهەموو شوێنێکدا هەبوو . وادیار بـوو کەبـەردەوام لـەملاولای کاترینە .

(( شێوەی چۆن بوو ؟ )) .

« تەنها یەک... سپی یە... وەکو نور . دەم و چاوی نەبوو ، نەک وەکو ئەوەی کەدەیناسین ، بەڵام دەزانم کە خۆیەتی »

(( پەیوەندی پێوەکردی یان شتێکی پێ گووتی ؟ )) .

« نەخێر ، تەنها سەیری دەکرد » .

(( گوێی لەوە دەگرت کەمن وتم ؟ )) .

« بەڵێ ، بەڵام ئێستە ڕۆیشتووە . هەر ویستی بزانێ تەندروستیم باشە » .

بیرم دەکردەوە لەچیرۆکی ئەفسانەی فریشتەی پارێزەر کەجێی هۆگری هەموانە . ئیدوار ڕۆحێکی عاشق و هەوایی بوو چاودێری دەکرد تا زیانێك بەکاترین نەگات و بەم پێیە ڕۆڵی فریشتەی دەبینی . کاترین پێشتر دوابوو دەربارەی ڕۆحە پارێزگارەکان . نەمدەزانی چەندە لەئەفسانەکانی تەمەنی منالیمان و رابردوانێ کەوەکو خەیاڵ لەبیرمان دێن سەرچاوەیان گرتووە .

بیریشم لەبارەی زنجیرە مورەتەبەکانی ڕۆح کرددەوە ، لەم بارەوەی کە کێ پارێزەرو کێ ڕۆحی مەزن و کێش هیچ کام لەمانەبوو تەنها لەقۆناغی فێربووناوبوو . پلەبەندی دەبێ لەسەر بنەمای زانست و دانایی بێ و بەئامانجی کۆتاییو نزیکتربوونەوە لەخوداو یەکبوون و پەیوەستبوون بێ بەوەوە . ئەمە ئامانجێ بوو بەدرێژایی ئەم سەدە سۆفیەکان بەوشەی سەرنجڕاکێش وەسفیان کردبوو . ئەوان چەند شکڵێکیان لەوەحدەتی ئیلاهی دیتبوو . خۆمن نەمدەتوانی ئەزموونی وەها شتێ بکەم ، کەسانی وەك کاترین بەتوانای ناوازەوە باشترین دیدگای بۆفەراهەم دەکردم .

ئیدوارد ڕۆشتبوو کاترینیش بێدەنگ بووبوو . دەم وچاوی ئارام و خۆشی لەئارامیەکی قوڵدابوو . چ توانایەکی بێوێنەی لە چنگابوو ، توانای

بینینی ئەودیو ژیان و مەرگ ، قسەکردن لەگەڵ ڕۆحە مەزنەکان و هاوبەشی
ەقڵو دا: یان . ئێمەش خەریکی خواردن لەبەری درەختێکی زانست
بوین کەچی دی مانای نەبوو . نەشمان دەزانی چەند سێوی تری پێوەماوە.

( مینیت ) دایکی کارول ، بەهۆی شێرپەنجەی سنگ و ئێسك و
جگەرەوە لەمردن نزیك دەبۆوە . ئەمە چوار ساڵ بەردەوامبوو چی دی
نەدەکرا لەڕێی دەرمانی کیمیاییەوە تیماری بکەیت . ئەو ئافرەتێکی دلێر
بوو هێورانە بەرگەی دەردو لاوازی دەگرت . نەخۆشیەکەی بەخێرایی
لەپەرەسەندنابوو دەمزانی لەمەرگ نزیك دەبێتەوە .

هاوکات دانیشتنەکانم لەگەڵ کاترین بەردەوام بوو وەمن ئەم ئەزمون و
باسانەم بۆ ( مینیت ) باسدەکرد . تاڕادەیە سەرسام بووم لەوەی ئەو
ئافرەتێکی بازرگان بوو ئەم زانستەی وەرگرت و دەیویست زیاتر بزانێ .
کتێبی زۆرم پێ' و بەتاسەوە دەیخوێندەوە . ئەو خولێکی بۆمن و ک'رول
ڕێکخست و خۆشی تیا بەژداربوو . ئەم خولە دەربارەی ڕوداوەکانی بەنی
ئیسرائیل بوو ، کەبریتیبوولە دەسنوسی سۆفییەکانی یەهود کەزۆر قەدیمین
. گەڕانەوەو گەشتی ڕۆح و پلەی بەرزەخ باسە سەرەکیەکانی ئەم ڕووداوانە
بوون ، بەڵام زۆربەی یەهودیەکانی ئەم زەمەنە ائ‌ی بێئاگان . تادەبوو
لاشەی مینیت ڕوو لەـزیو لەناوچوون دەبوەوەو ڕۆحیشی بەهێزتر دەبوو .
ترسی لەمەرگ نەدەماو لەچاوەڕوانی دیداری هاوسەرە خۆشەویستەکەی
(بێن) بوو . ئەو بڕوای بەفەنانە بوونی ڕۆح هەبوو هەر ئەمەش یارمەتی دەدا
تابەرگەی دەردو ئازار بگرێ . هەروەها چاوەڕوانی نەوەیەکی تری لەیەکەم
کچی ( دورا ) بوو .

(مینیت ) کاترینی لەیەکێ لەنەخۆشخانەکان بینی بوو ، بێگەردیو ڕاستگۆیی کاترین ئەوی ڕازی کردبوو کەژیانی پاش مردن هەیە .

(مینیت) هەفتەیە بەرلەمردنی لەبەشی ( ئونکولۆژی ) لەنەخۆشخانە خەوێنرا . من و کاترین دەمانتوانی کاتەکانمان لەگەڵیا بەرینە سەرو لەبارەی مەرگ و ژیان و ئەوەی پاش مردن لەچاوەڕوانی هەموومانداییە بدوێین . ئەو ئافرەتێکی بەویقاربوو بڕیاریدا لەنەخۆشخانەو لەجێیە کەپەرستیاران دەتوانن چاودێری بکەن بمرێ . (دورا )و هاوسەرەکەیی و مناڵە شەش هەفتەکەی هاتنە نەخۆشخانە تا بۆ دواجار ببینن و ماڵئاوایی لێبکەن . ئێمە بەردەوام لەگەڵیا بووین . ڕۆژێك کاژێر شەشی پاش نیوەڕۆو بەر لەمردنی ، ئێمە تازە لەنەخۆشخانەوە گەشتبووینە ماڵەوە . هەردوومان هەستمان کرد کە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ نەخۆشخانە . شەش یان حەوت کاژێری دوای ئەوەشر بەئارامی و هێزی ڕۆحیەوە تێپەڕی . سەرباری ئەوەی هەناسەدانی دژوار بوو بەڵام چی دی ئازاری نەبوو . ئێمەش دەدواین لەبارەی ڕاگواستنی بۆ قۆناغی بەرزەخ و ڕووناکیە بەهێزەکەو ڕۆحە مەزنەکان . ئەو چاوەڕوانی زەمەنی دیاریکراو ( بەرەبەیان ) بوو بۆمردن . ئەو یەکەم کەس بوو کەبەو چەشنە ئامادەم کرد بۆمردن . مینیت بەهێز بوو خەمی ئێمەش بەهۆی ئەمەوە کەم دەبوو .

هەستم کرد توانام زۆر بەهێز بووە نەك تەنها لەترس و نیگەرانی دەروونی بەڵکو سەبارەت بەمەرگ ... مردن یان غەم . ئەمزانی گرفتەکەی لەچیدایەو بۆچارەسەرکردنی پێویستە چ ڕێگایە هەڵبژێرم . ئەمتوانی ئاسایش و ئارامی بەخەڵك بدەم . لەدوای مردنی مینیت زۆر خەڵك کە لەسەرەمەرگا بوون یان غەمی مردنی ئازیزانیان ئازاریان دەدان ، بۆ یارمەتی

دانيان دەهاتنەلام . هەندێکیان ئامادە نەبوون دەربارەی کاترین و ژیانی پاش مردن شت بزانن ، بەلاّم تەنانەت بەپێدانی ئەم زانیاریانە هەستم دەکرد دەتوانم قسەکانم بگەیەنم .

ئیمڕۆکەش خەڵك بەگشتی بەهەڕەشەی مەرگ گەمارۆ دراون . بەلاّی ئایدز ،چەکە ئەتۆمیە کۆمەڵ کوژەکان ، تیروریزم و نەخۆشی و زۆرێك لەبەلاّکانی دی سێبەریان بەسەرمانەوە کردوەو ڕۆژانە دەمانترسێنن و ئازارمان دەدەن . زۆربەی نەوجەوانان بڕوایان وایە ناگەنە تەمەنی بیست ساڵی . ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە زۆر سەیرو نیشانەی فشارە دەروونیە توندەکانە لەکۆمەڵگای ئێمەدا .

پەرچەکرداری ( مینیت ) بۆکاترین هیوا بەخش بوو . ڕۆحی بەهێزدەبوو لەگەڵ بوونی دەردی بەهێزداو شیبونەوەی لاشەیدا ئومێدی زیاتر دەبوو . بەلاّم ئەم پ. .امانە بۆگشتمانە نەك تەنها بۆ ئەو کەسانەی لەسەرەم. .گدان . ئومێدیش بۆئێمە هەیە . ئێمە پێویستمان بەپزیشك و زانای زۆرە تاگوزارشتی .. .رینەکانی تر ئامادە بکەن . پاڵپشتی پەیامەکانی ئەو بکەن و بلاّوی بکەنەوە . وەلاّمەکان لەوێن . ئێمە نەمرین و هەمیشە پێکەوە دەبین .

سێ مانگ و نیو لەیەکەم دانیشتنی هیپنۆتیزم تێپەڕیبوو. نەك هەرئەوەی ئاسەواری نارەحەتییەکانی کاترین نەمابوون بەڵکو پێشکەوتنی لە لەچارەسەرکردنیش تێپەڕیبوو. دڵی خۆش و شادومان بوو، خەڵکی جەزبی ئەبوون. کاتی بەیانیان کەلەکافتریا نانی دەخوارد ئافرەت و پیاو لەدەوری خردەبوون. پێیان دەووت زۆر سەرنجڕاکیش بوویت و هەرویستومانە ئەمەت پێبڵێین. ئەمە هاوکاتە لەگەڵ ئەوەی ساڵانێکی زۆر بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت لەهەمان کافتریا نانی دە خوارد.

هەروەك جاران قژەبۆرەکەی وەك تاڤگە بەسەر شان و ملیا هاتبوونە خوارەوە، بەزویی چووە خەواندنەوە.

« بالآخانەیەك دەبینم... لەبەرد دروستکراوەو شتێکی نوکتیژ بەسەریەوەیە. ناوچەیەکی کوێستانییە. زۆر شێدارە... دەرەوە زۆر شێدارە. ئەسپ و عەرەبانەیە دەبینم لەبەردەم بالآخانەکەوە دەڕوا. عەرەبانەکە ئالیکی تێدایە. قامیش یان ئالیکو لەو بابەتە کەئاژەڵان دەیخۆن. کۆمەڵێك پیاوی لێیە. ئالایەك بەرزدەکەنەوە و شتێکە بەکۆتایی دارێکەوە دەجوڵێتەوە. ڕەنگەکانی ڕوونن. دەبیستم باس لەجەنگێك دەکەن... کەلە ڕوودانایە. ساڵی ١٤٨٣یە. شتێك دەربارەی

**دانیمارکییەکان. پێدەچێ لەگەڵ دانیمارکییەکان بجەنگین. جەنگێ لەهەڵگیرساندایە».**

(( تۆش لەوێی؟))

**« نازانم. ئەسپ و عەرەبانەکان. دووتایەیان هەیە، لاتەنیشت و پێشەکانیان کراوەیە. تەختەکانیان باریکن، تەختەیەکی باریک ڕاگیری کردوون. ڕوتەختێکی کانزا... ئەبینم بەلاکانیانەوەیە... کانزای زۆر ڕەق لەشێوەی خاچ دا. بەڵام بنکەکانیان خوارن. کۆتاییەکانیان خڕە. بۆنەیەکی پیرۆزە... شمشێرەکان دەبینم. ئەوان قەمەیان شمشێریان پێیە... زۆر قورس و نوک تیژن. خۆیان بۆجەنگ ئامادەکەن».**

ڕێنومایی‌م کرد: (( بزانە ئەتوانی خۆت بدۆزیەوە. تەماشای ئەملاو لابکە، لەوانەیە سەربازبیت و ئەوان لەشوێنێکی ترەوە ببینی)).

بەپچڕی ووتی:**«من سەرباز نیم».**

(( سەیری دەوورو بەرت بکە))

**« هەندێ ئازوقەم هێناوە. دێیەک هەیە... دێ.»** بێدەنگ بوو.

(( ئێستە چی ئەبینی؟))

**« ئالآیەک ئەبینم. ئالآیەکی سورو سپی یە... سپی بەخاچێکی سورەوە».**

پرسیم: (( ئەمە ئالآی ئێوەیە؟))

**« ئەمە ئالآی سەربازانی شایە».**

(( شای ئێوەیە؟))

**« بەڵێ».**

((ناوی پاشاکە ئەزانی؟))

« ناوی نابیستم. لێرە نییە».

(( ئەتوانی تەماشاکەی و بزانی چیت لەبەردایە؟))

« چەرمێك... بەسەر کراسێکی زۆر زبردا... کورتیشە. پێڵاوێکیش لەپێستی ئاژەڵ... پێڵاو نییە، زیاتر لەشێوەی چەکمە یان پێڵاوی سور پێستە. کەس قسەم لەگەڵ ناکات».

(( تێئەگەم، قژت چ ڕەنگە؟))

« ڕوونە. بەڵام پیرم و هەندێ لەقژم خۆڵەمێشییە».

(( هەستت چۆنە دەربارەی ئەم جەنگە؟))

« ئەمە ڕەوتی ژیانم بووە. کوڕێکم بەسەکتەی دڵ لەدەستداوە».

(( کوڕێك؟))

« بەڵێ.» ئەو غەمگین بوو.

(( کێت بۆ ماوەتەوە؟ لەخێزانەکەتاندا کێت بۆ ماوەتەوە؟))

« ژن و... کچەکەم».

(( کوڕەکەت ناوی چی بوو؟))

« نازانم. بیری لێئەکەمەوە. ژنەکەم دەبینم.» کاترین هەم وەکو پیاو هەم وەکو ئافرەت چەند جارێ ژیابوو. لەژیانی پێشویدا منداڵی نەبوو، بەڵام لەوانی تریدا منداڵی هەبوو.

(( هاوسەرەکەت چۆنییە؟))

« زۆر ماندووە، زۆر پیرە. هەندێك بزنمان هەیە».

(( هێشتا کچەکەتان هەر لەگەڵ ئێوەدا دەژی؟))

« نەخێر شووی کردووەو ماوەیەکە لامان نەماوە».

(( کەوابوو تەنهایت، هەر تۆو هاوسەرەکەت؟))

« بەڵێ».

(( ژیانت چۆنە؟))

«ئێمە ماندوین. زۆر هەژارین، ئەمەش کەم نەبووە.»

(( کورەکەتت لەدەستداوە؟ بیری ئەو دەکەیت؟))

تەنها وەلامی داوە:« بەڵێ»، بەلام غەمی پێوە دیار بوو.

مەسەلەکەم گۆڕی: (( جوتیار بووی؟))

« بەڵێ. گەنمم هەیە... گەنم، شتێکی وەك ئەو».

((ئایا لەژیانتدا، لەووڵاتەکەتدا جەنگ بەبەلاو نەهامەتی زۆرەوە هەلگیر ساوە؟))

« بەڵێ؟».

(( تۆ زۆر بەپیری مایتەوە؟))

ڕوونی کردەوە: « ئەوان دوور لەدێهاتەکە دەجەنگن نەك لەناو گوندەگە. پێویستە سەفەربکەن بۆ ئەوشوێنەی کەتیا دەجەنگن... دەبێ شاخەو شاخی زۆر بکەن».

(( ناوی وڵات یان ئەو شارەی تیایدا دەژیت دەزانی؟))

« من نایبینم بەلام دەشێ ناوێکی هەبێت. هیچ نابینم».

(( وادیارە ئەم قۆناغە بۆتۆ مەزهەبیە وابەسەر جلی سەربازەکانەوە خاچ ئەبینی )) .

« بۆمن نا بەلام بۆخەڵکی تر بەڵێ » .

(( جگە لەخێزان و کچەکەت کەسی ترت زیندوون ؟ )) .

« نەخێر » .

(( باوك ودایکت مردوون ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( براو خوشکەکانیشت ؟ )) .

« خوشکێکم ماوە. نایناسم » .

(( بزانە کەسیترلەگوند یان خێزانەکەت ئەناسی ؟ )) ئەگەر خەڵکی بەکۆمەڵ دەگەڕانەوە بۆ لاشەکان ئەگەری ئەوە هەبوو لەوێ کەسێ بدۆزێتەوە لەژیانی ئێستایدا گرنگ بێ .

« مێزێکی بەردین ئەبینم ... وەهەندێ کاسەش » .

(( ماڵەکەتە ؟ )) .

«بەڵێ . شتێکی وەک گەنمەشامی ... زەردە ... یان شتێکی ... زەرد. ئێمە ئەوە ئەخۆین » .

(( زۆر باشە )) هەوڵمدا دەسوبرد کەم . (( لەم قۆناغەدا ناسۆریت چەشتووەو ژیانێکی پڕ لەچەرمەسەری . بیر لە چی ئەکەیتەوە ؟ )) .

لەژێر لێوەوە وتی : « ئەسپ » .

(( تۆ ئەسپت هەیە یان کەسێکیتر هەیەتی ؟ )) .

« نەخێر ، سەربازان ... هەندێکیان ، زۆربەیان پیادەن . بەڵام ئەوانە ئەسپ نین و وڵاخن ، یان شتێ بچوکتر لەئەسپ. زۆربەیان درندەن » .

(( ئێستە زەمەن تێپەڕێنە . تۆ زۆر پیربوویت و هەوڵبدە بگە بەدواین ڕۆژی ئەم قۆناغەی ژیانت )) .

نارازی بوو : « من زۆر پیرنیم » تەنانەت لەژیانەکانی پێشوویدا بەهەموو شتێ بەئاسانی قایل نەدەبوو . ئەوەی دەقەوما ، دەقەوما . من ئەمتوانی بەقسەو ڕێنومایی کردن ئەوەی کەڕویدابوو بیگۆڕم . نەم ئەتوانی ببمە هۆی ئەو جورئیاتانەی کەڕوویدابوو بیری دەهاتن بیانگۆڕم .

شێوازی هەڵسوکەوتم گۆڕیو پرسیم : (( هیچیتر لەو ژیانەتدا دەقەومیّ کەزانینی بۆمان گرنگ و بەسودبیّ؟))

« شتێکی ئەوتۆ ناقەومیّ » .

(( کەوابوو بچووە پێشتر بابزانین دەبیّ فێری چی ببی ، ئەزانی ؟ )) .

« نەخێر ، من هێشتا لەوێم » .

(( بەڵیّ ئەزانم . هیچ ئەبینی ؟ )) یەك دوو خولەکی خایان تاوەڵام بداتەوە .

« من هەڵاژاوم » .

(( ئێستە لەلاشەت دەرچوویت ؟ )) .

« بەڵیّ ، هەڵاژاوم . » دووبارە چوو بوەوە پلەی ڕۆح .

(( ئێستا ئەزانی ئەبوو فێری چ شتیّ بویتایە ؟ ئەمەش یەکێکیتر لەقۆناغە دژوارەکانی ژیانت بوو )) .

« جاریّ نازانم . هەر هەڵاژاوم » .

(( زۆر باشە پشوویە ... )) چەند خولەکیّ تێپەڕی ، پاشان وادیاربوو گویّ لەشتیّ دەگریّ و کتوپڕ هاتەگۆ. دەنگی بەرزو نزم بوو . ئەمە کاترین نەبوو .

« ژیان حەوت پلەیەو هەر پلەیەکیش چەندین لقی هەیە . یەکێک لەوانە پلەی فێربوونە . لەو ئاستەدا ئەتوانیت بیری خۆتت لەیادبیّ . ئەتوانی ئەو ژیانەی کەدواجار تێتپەڕاندووە ببینی . ئەوانەی لەپلەیەکی بەرزتردان دەتوانن مێژوو ببینن و ئێمەش فێری ئەوانە بکەن . بەڵام ئێستا لە پلەیەکی نزمداین ، ئەتوانین تەنها ژیانی خۆمان ... کەتازە تێپەڕیوە ببینین .

ئێمە قەرزێکمان لایە پێویستە بیاندەینەوە . ئەگەر ئەم قەرزەمان نەدابێتەوە پێویستە بیانبەین بۆژیانێکی تر ... مرۆڤ لەرێی دانەوەی قەرزە؟ وە پێشدەکەوێ . هەندێک لەرۆحەکان زووتر لەوانەیتر پێشدەکەون . ئەو وەختەی مرۆڤ لەلاشەی دایە لەساتی دانەوەی قەرزەکانییەتی . ئەگەر شتێک بەر لەئەنجامدانی ئەم کارەی بگرێ ئەبێ بگەرێتەوە پلەی فێربوون و چاوەروان بێ تائەو رۆحەی کەئەم قەرزاریەتی بێتە دیداری . وەختێ ئەو دووانە لەیەککاتدا بتوانن بننە لاشە ئەوا مۆڵەتی گەرانەوەیان دەبێ و دەتوانن بگەرێنەوە . بەڵام ئەوە هەر مرۆڤە بریار دەدات چ کاتێ بگەرێتەوە . هەر ئەوە بریار دەدات لەپێناو دانەوەی ئەو قەرزەدا دەبێ چ کارێ ئەنجام بات . ئیتر ئەوکەسە ژیانە پێشووەکانی بەبیردانایە... هەر ئەو ژیانە نەبێ کەتازە بەتازە وەلای ناوە. تەناها ئەو رۆحانەی لەپلەیەکی بەرزتردان (حەکیمەکان ) مۆڵەتیان هەیەو دەتوانن رێگە بەرن بە مێژوو رووداوەکانی پێشوو ... وەیارمەتیمان بدەن و فێرمان بکەن )) .

(( حەوت پلە هەیە... حەوت پلە کە لە گەرانەوەمان ئەبێ تێمان پەراندبێ . یەکێک لەوانە پلەی گواستنەوەیە . تیایدا مرۆڤ چاوەروان ئەبێ و لەویادایە بریار دەدرێ کەچ تایبەتمەندییەک بۆژیانی دواترتان بەری . هەمووومان یەک... (ئاکاری فرەامان هەیە . رەنگە ئەمە تەماع یان ئارەزوو بێ ، بەڵام هەرچی بێ مرۆڤ فەرمانبەرە قەرزەکەی خۆی باتەوە . پاشان پێویستە بەسەر ئەم ( ئاکاری ) لەهەمان قۆناغی ژیانیا سەرکەوێ . دەبێ فێری هەیمەنە بی بەسەر تەماعدا . ئەگەر وانەبێ وەختێ دەگەرێتەوە دەبێ ئەم (ئاکارە )یە لەگەڵ دانەیەکی تر بوژیانی

دواتری بەرێ . ئەوسا ئەوبارەی هەڵیئەگری قورسترو گـەورەتر دەبـێ . لەگەڵ هەر ژیانێكدا كەبەسەری ئەبەیت و قەرزەكەت نادەیتـەوە ژیـانی دواترت دژوارتر دەبێ . ئەگەر قەرزەكەت بەیتـەوە ژیـانێكی ئاسـودەت ئەبێ ، هەڵبژاردنی جۆری ژیانـت بەگـەردنی خۆتـەو بەتـەنها بەرپرسـی هەمان ژیانیت» كاترین بێدەنگ بوو .

ئـەم پەیامـە بەڕواڵـەت لەلایـەن ڕۆحێكـی مەزنـەوە بـوو . ئـەو ڕۆحـەی واخۆی ناساند كە « ئێمە لەپلەیەكی خوارتردایـن » لەچاو ڕۆحەكانی دی كە لە پلەی باڵادان ( واتە حەكیمەكان ) . خوازیار بووم لەبارەی پێنج پلەكـەی ترو تایبەتمەندییەكانیەوە بزانم . ئایا قۆنـاغی نوێبوونـەوە یـەكێك بـوو لـەو پلانە ؟ وەقۆناغی فێربوون و بڕیـاردان لـەقۆناغێكی تـر بـوون ؟ گشت ئـەو زانیاریانـەی لەڕێگـەی پـەیامی ڕۆحـەكان كەلەڕەهەنـدی جـۆراو جـۆرەوە گەشتبووە پلەی ڕۆح هاوتابوون . گەرچی شێوازی گەیاندن و ڕستە بەنـدی و ڕێزمـان و ئـاڵۆزیو شێوەی پەیامـەكان جیـاواز بـوون لەگـەڵ یـەك بـەڵام لـەڕووی ئاسـتەوە پەیوەندییـەكی لۆژیكییـان هـەبوو . منـیش لەسـاتی دەسكەوتنی كۆمەڵێك لەزانستی ڕۆحانی بووم . زانـستێ لەڕێگـەی عیـشق و ئومێدو ئیمانەوە دەگوتراو ئـەو قەرزانـەی تـاوتوێ دەكـرد كـەلای خۆمـان و خەڵكی تریشە . ئـەم زانـستە گـشتگیری قۆناغـەكانی ژیـانی پێشوو پلـەی ڕۆحانی ئـەوان بـوو وەدەربـارەی پێشكەوتنی ڕۆح لەڕێگـەی هەماهـەنگی و هاوسـەنگیو حیكمـەت و عەشـق و دروسـكردنی پەیوەنـدی عاریفانـەو پـڕ لەجەزبە لەگەڵ خواوەند ئەدوا .

بەدرێژایی ئـەم ڕەوتـەمان ئامۆژگـاری بـەهاداری دابەگوێمانـدا : بـەهای سەبرو چاوەڕوانی ، بەدەسهێنانی زانست بەڕێگەی بەڵگـەوەو هاوسـەنگی و

هەماهەنگی لەسروشتدا ، ڕیشەکێش کردنی ترسەکان بەتایبەت ترس لەمەرگ ، متمانەو بەخشش ، ئەمەی کەنابێ دادوەری دەربارەی خەڵکی بکەیت و یان خەڵك بکوژی ، وەپێئەچێ گرنگتر لەهەموو ئەمانە ئەمەبێ کەئێمە نەبڕاوەین . ئێمە لەودیوی ژیان و مردنەوەین و پترلەزەمەن و مەکانین .

کاترین بەئارامی وتیەوە : (( هەڵاژاووم )) .

پرسیم : (( لەچ بارێکدای ؟ )) .

(( هیچ ... هەڵاژاوم ... ئیدوارد شتێ قەرزای منە ... ئەو قەرزارمە)) ..

(( ئەزانی قەرزاری چی شتێکە ؟ )) .

(( نەخێر ... هەندێ زانیاری ... قەرزارمە ... شتێکی پێبوو تا پێمبڵێ. لەوانەیە دەربارەی خوشکەزاکەم ...)) .

(( خوشکەزاکەت ؟ )) .

((بەڵێ ... کچێکە ناوی "ئیستفانی"ە))

((ئیستفانی ؟ دەبێ چی دەربارەی بزانی ؟ )) .

(( ئەبێ بزانم چۆن پەیوەندی پێوەبکەم )) . هەرگیز کاترین لەبارەی خوشکەزاکەیەوە نەدوابوو .

پرسیم : (( ئەو زۆر لەتۆوە نزیکە ؟ )) .

(( نەخێر ، بەڵام گەرەکیە ئەوان بدۆزێتەوە )) .

پرسیم : (( کێ بدۆزێتەوە ؟ )) .

(( خوشکەکەم، مێردەکەی . تەنها لەڕێگەی منەوە ئەتوانێ ئەمکارە بکات . من پەیوەندییەکم . ئیدوارد زانیاری هەیە ، باوکی ئیستفانی

دکتۆرە ، ئەو لەشوێنێک لە ( ڤێرمولت ) کار دەکات . لەباشوری ڤێرلمونت . وەختێ پێویست بکات ئەم زانیارییەم پێدەگات » . دواتر زانیم خوشکەکەی کاترین و مێردی ئایندەی کچەکەیان سپاردبوو بۆ ( فرزند خواندگی ) لەو وەختانە نەوجەوان بوون و هێشتا نەبووبوونە هاوسەری یەکتر . ڕێکخستنی فرزند خواندگی کچەکەیان لەڕێگەی کڵێساوە کرابوو . لەپاش ئەوە ئیتر هیچ هەواڵ و زانیاریەکیان نەدەزانی لەبارەی کچەکەیانەوە

پێداگریم کرد : (( بەڵێ ، وەختێ زەمەن گونجاوبێت )) .

« بەڵێ ئەوکاتە ئەو پێم دەڵێ . ئەو پێم دەڵێ » .

(( چی زانیاریەکی تری پێیە بۆت ؟ )) .

« نازانم ، بەڵام ئەو شتی زۆری بۆگوتن بۆمن پێیە . ئەو شتێ قەرزارمە ... شتێ . ناشزانم چییە ، ئەو قەرزارمە » بێدەنگ بوو .

پرسیم : (( ماندووی ؟ )) .

وەڵامەکەی ئەمەبوو : « ڕەشمەیەک ئەبینم . کەل و پەلی پێویست لەسەر دیواری . ڕەشمەیەک...بەتانیە ئەبینم لەدەرەوەی تەویلەکەدایە» .

(( ئایا عەمباری کشتوکاڵە ؟ )) .

« ئەوان ئەسپیان هەیە ئەسپی زۆر » .

(( چیتر ئەبینی ؟ )) .

« درەختی گوڵ زەرد ئەبینم ، باوکمی لێیە . چاودێری ئەسپەکان ئەکات » . تێگەشتم لەگەڵ منالێکدا دەدوێم.

(( شێوەی چۆنە ؟ )) .

« بالآی بەرزە ، قژی خۆڵەمێشی یە » .

(( خۆت ئەبینی ؟ )) .

« کچێکی ... منالم » .

(( ئەسپەکان هی باوکتن یان هەر چاودێریانە ؟ ))

« هەرچاودێریانە . ئێمە لەو نزیکانە ئەژین » .

(( ئەسپەکانت خۆش دەوێ ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( هیچ کام لەوانەت زیاتر لەهەموان خۆش دەوێ ؟ )) .

« بەڵێ . ئەسپەکەم ناوی ئەپڵە » کەوتمە بیری ئەو قۆناغەی ژیانی کەناوی " مەندی " بوو . ئەوکاتەی ئەسپێك بەناوی ئەپڵ دەرکەوتبوو . مەبەستی بوو قۆناغی ژیانێ کەپێشتر باسی کردبوو دووبارە بکاتەوە ؟ ڕەنگە ویستبێتی لەگۆشە نیگا: کی ترەوە لێی نزیك بێتەوە .

(( ئەپڵ ... ئەی باوکت ئەیەڵێ سواری ئەپڵ بیت ؟ )) .

« نەخێر ، بەڵام ئەتوانم ئالیکی پێبدەم . باوکم فەرمانی بەکێشکردن و هێنان و بردنی عەرەبانەی ئەربابە ، ڕاکێشانی گالیسکەکەی . ئەو ئەسپە زۆر گەورەیە . قاچی گەورەیەو ئەگەر ئاگات لەخۆت نەبێ جوتە دەهاوێ» .

(( کەسی ترت لەگەڵە ؟ )) .

(( دایکم لەوێیە . خوشکێکم ئەبینم ... گەورەترە لەمن . هیچ کەسیتر نابینم )) .

(( ئێستە چی ئەبینی ؟ )) .

« هەر ئەسپەکان » .

(( مایەی خۆشحاڵیە بۆت ؟ )).

« بەڵێ ، کەیفم بەبۆنی عەمبارەکە دێ » . ووردی و درشتی دەدوا .

(( هەست بەبۆنی ئەسپەکان ئەکەیت ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( بۆنی کاش ؟ )) .

«بەڵێ ... دەم و چاوویان زۆر نەرمە . سەگیشی لێیە ... ڕەش ... سەگی ڕەش و پشیلە ... ئاژەڵی زۆری لێیی . سەگەکان بۆ ڕاوکردن بەکاردێن . وەختێ بۆ ڕاوی باڵندە دەچن سەگەکان دەبەن » .

(( توشی هیچ کارەساتێك ئەبیت ؟ )) .

« نەخێر » .

(( لەم کێڵگەیە گەورە دەبی ؟ )) .

« بەڵێ . ئەو پیاوەی چاودێری ئەسپەکان دەکات » هەڵوێستەیەکی کرد . « ئەو بەڕاستی باوکی من نییە ؟ » سەرگەردان بوو بووم .

(( باوکی خۆت نییە ؟ )) .

« نازانم ، ئەو ... باوکی ڕاستەقینەم نیە نەخێر . بەڵام وەك باوك وایە بۆم . باوکی دووەممە . زۆر باشە لەگەڵم . چاوەکانی سەوزە » .

(( لەچاوە سەوزەکانی ووردبەرەوەو بزانە ئەیناسی ؟ لەگەڵتا باشەو خۆشی دەوێی )) .

« باوە گەورەمە ... باوە گەورەم . ئێمەی زۆر خۆش دەویست . هەمیشە ئەیبردین بۆگەڕان . ئەیبردین بۆ جێگەیە خۆی مەیی دەخواردەوەو ئێمەش ساردی . ئەو ئێمەی خۆشدەویست » پرسیارەکەم بووە هۆی ئەوەی بەتوندی ڕاچەنێ و لەو ژیانە دەرچێو بچێتە دۆخی

ئاگاییەوە . ئێستا وەکو کاترین و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ باوە گەورەیدا هەیبوو ئەیڕوانی .

(( ئێستەش هەر بیری ئەکەیت ؟ )) .

بەنەرمی وتیەوە : « بەڵێ » .

(( بەلام خۆپێشتریش لەگەڵت بووە )) بۆم ڕوونکردەوەو هەوڵمئەدا لەبێتاقەتیەکەی کەم بکەمەوە .

« زۆر باش بوو بۆمان و خۆشی ئەویستین . لەژیانیدا دەنگی بەرزنەکردەوە بەسەرماندا . خەرجی دەداینێ و بەردەوام لەگەڵ خۆی ئەیبردین . مەیلی بەم کارە بوو بەڵام مرد » .

(( خۆت ئەوە ئەزانی کەدووبارە لەگەڵی دەبیت )) .

« بەڵێ ، پێشتریش هەر لەگەڵیابووم . ئەو وەك باوکم نەبوو ، زۆر جیاوازن لەگەڵ یەکتر » .

(( باشە بۆ کەسێك هێندە خۆشی دەوێیت و باشە لەگەڵت و یەکێکی دی جیاوازە ؟ )) .

« لەبەرئەوەیە تێگەشتوەو خوێندویەتی و فێریش بووە ، پاشان قەرزی خۆشی داوەتەوە . باوکم هێشتا هەر قەرزارەو گەڕاوەتەوە ... بەبێ ئەوەی تێبگاو فێر بێ . پێویستە ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێ » .

پێداگریم کرد : (( بەڵێ ئەو دەبێ فێری خۆشەویستی بێ و چاودێری بکات )) .

« بەڵێ » .

(( ئەگەر ئەوان ئەمە ئەزانن و تێئەگەن ، لەبری ئەوەی لەگەڵ منالاًنـدا بەسـۆزو خۆشەویـستیەوە هەڵـسوکەوت بکـەن وەکـو پێویـستیات ڕەفتـار دەکەن )) .

ئەویش ڕازی بوو : « بەڵێ » .

(( باوە گەورەت ئەزانێ ... )) .

قسەکەمی بڕی : « ئەزانم . وەختێ لە لاشەداین پێویستە قۆنـاغی زۆر بەرینە سەر ... هەروەکو قۆناغەکانی تری کامـڵ بـوون. دەبـێ قۆنـاغی ساوایی ومناڵی و باڵغی تێپەڕێنین ... ڕێگایەکی زۆر دورو درێژ هەیە بـەر ... بەر لەگەشتن بەئامانجمان .

ئەو وەختەی لەلاشەداین تێپەڕاندنی ئەم قۆناغانە ناسۆریەو دژوارە بەڵام لەپلەی ئاسمانیدا ساناو سادەیە . لەوێ هەر پشوو ئـەدەین و چـاوەڕوان دەبین . بەڵام ئەوکاتەی لەلاشەداین کوللە مەرگییە » .

(( چەند پلە هەیە لەڕۆحدا ؟ )) .

« حەوت پلە » .

پرسیم : (( ئەو پلانە چین ؟ )) خوازیاربووم جگە لەو دووباسەی پێشتر کەلەم دانیشتنەدا باسکرابوو پلەکانیتر بەیان بکات .

« تـەنها دوو پلـەیان پـێ ووتـوم ، قۆنـاغی گواسـتنەوەو قۆنـاغی فێربوون».

(( منیش ئاشنای ئەم دووانەم )) .

« قۆناغەکانی دی پاشتر ئەیانزانین » .

وتم : (( هەردوومان لەیەککاتدا فێـر بـووین . ئـەمڕۆ فێـری وانـەی قـەرز بووین ، ئەمە زۆر گرنگە )) .

بەشێوازێکی نهێنیانە وتی : « ئـەوەی پێویـستە لـەبیرم بـیَ ، لـەبیرم دیَ».

پرسیم : (( ئەو پلانەی تر بەبیردێنی ؟ )) .

« نەخێر ، ئەو شتانە بەلامەوە گرنگ نین . بۆتۆ گـرنگن » پێـشتریش هەرئەمـە درابـوو بـەگوێما . بـۆمن بـوون تايارمـەتی بـەم ، بـەلاّم زيـاتر لـەو بۆيارمەتی خۆم بوو لەگـەڵ ئەوەشـدا نەمـدەتوانی پەيپێبـەرم ئـەو ئامانجـە گەورەترە چی بوو .

بەردەوام بووم : (( وادیارە لەپێشکەوتندای و خـەریکی فێـری زۆر شـت دەبیَ )) .

جەختی کردەوە : « بەڵیَ » .

(( بۆ خەڵك هێندە جەزبی تۆدەبن و دێنەلات ؟ )) .

« لەبەرئەوەی دەربازم بووە لەترسی زۆرو ئەتوانم یارمەتیان بـدەم . ئەوان جۆرە کۆشییێکی ڕۆحیان هەیە بۆمن » .

(( توانای ئەمەت هەیە ؟ )) .

« بەڵیَ » . گومان نەبوو لەمە . ووتیشی : « من ناترسم » .

(( زۆر باشە ، من یارمەتیت ئەدەم )) .

وەلاّمی داوە : « ئەزانم ، تۆ مامۆستای منیـت » .

---

* فرزند خواندە دايك وباوكێكە منالێكی تر بـەمنالی خۆيـان وەرگـرن ئەمـەش لـەئاينی مەسـيحيدا لەكلێسا ئە نجامدەدرێت.

کاترین دەرباز بووبوو لەترس و نائارامیەکانی . ئەو زیاتر لەڕادە ئاسایی بووبووەوە . قۆناغەکانی ژیانی دووبارە دەبوەوە . ئەمزانی نزیك بوینەتەوە لەخاڵی کۆتایی . بەڵام ئەو ڕۆژە پایزبوو دەمخەواندو نەمدەزانی لەم دانیشتنە تا دانیشتنی دواتری هیپنۆتیزم کەدوا دانیشتن بوو، پێنج مانگ مەودای دەبێ.

« حەکاکیەکان دەبینم . هەندێك لەوانە لەئاڵتون هەڵکۆڵراون . گوڵ دەبینم . خەڵکانێك ئەبینم گوزە دروستدەکەن . سورن ... مادەیەکی سور بەکاردێنن . باڵاخانەیەکی قاوەیی ئەبینم ، ئێمە لەوێین » .

(( لەناو ئەو باڵاخانەدای یان لەو نزیکانەی ؟ )) .

« لەناویدام . لەسەر شتی جۆراو جۆر کاردەکەم » .

پرسیم : (( کەئیش دەکەیت ئەتوانی خۆت ببینی ؟ ئەتوانی باسی خۆت بکەیت ؟ چیت لەبەرکردووە ؟ شێوەت چۆنە ؟ )) .

« چەشنە... پارچەیەکی سورم لەبەرە. پێڵاوەکانم گاڵتەجاڕین وەك کورسی . قژم قاوەییە. خەریکم چەشنێ پەیکەر دروستدەکەم . پەیکەری پیاوێکە... پیاو . گۆچانێکی پێیە ... خەڵکی تر خەریکی دروستکردنی شتەکانن ... لەکانزا دروستیدەکەن » .

(( ئەم کارە لەکارخانەدا ئەنجام دەدرێ ؟ )) .

« ئەمە هەر باڵاخانەیەکە . باڵاخانەیە لەبەرد دروستکراوە » .

(( ئەو پەیکەرەی کاری لەسەردەکەیت ، پیاوێ کەداردەستی پێیە ، دەزانی کێیە ؟)) .

«نەخێر ، پیاوێکەو بەس . ژمارەیەکی زۆر لەو پەیکەرانە لەملاولادان. بەلام دەزانین شێوەیان چۆنە . ماددەیەکی زۆر سەیرە ، ئیشکردن لەسەری زۆر دژوارە . قەڵەمە کانزاکان دەشکێنێ».

(( ناوی ئەو مادەیە ئەزانی ؟ )) .

« نازانم . بەلام سورە ، شتێکی سور » .

(( پاش ئەوەی پەیکەرەکەت دروسکرد ، چیلێئەکەن ؟ )) .

« دەفرۆشرێن . هەندێکیان لەبازاڕدا دەفرۆشن . هەندێکیشیان دەدرێن بەماڵی ئەشراف و نەجیبەکان . ئەوانی تریان دەفرۆشن » .

(( قەت لەگەڵ ئەو ئەشرافانەدا کڕین و فرۆشتننت کردوە ؟ )) .

« نەخێر » .

(( ئەمە کاری تۆیە )) .

« بەلێ » .

(( حەزت لێیە ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( ماوەیەکی زۆرە خەریکی ئەم کارەیت ؟ )) .

« نەخێر » .

(( لەم کارەدا لێهاتوویت ؟ )) .

« زۆریش نا » .

(( پێویستت بەئەزمونی زیاترە ؟ )) .

« بەڵێ ، من خەریکم فێردەبم » .

(( هێشتا لەگەڵ ماڵەوەتاندا دەژیت ؟ )) .

« نازانم ، بەڵام هەندێ سنوقی قاوەیی ئەبینم » .

(( سنوقی قاوەیی ؟ )) .

« کونی بچوکیان تێدایە. ناوەوەیان بۆشە . هەندێ لەپەیکەرەکان لەو بۆشاییانەدا دادەنێن . لەتەختە دروستکراون . ئێمە دەبێ پەیکەرەکان بۆئەوان دروستکەین » .

(( ئیشی پەیکەرەکان چییە ؟ )) .

« مەزهەبین » .

(( چ مەزهەبێ هەیە ، مەزهەبی پەیکەرەکان ؟ )) .

« خواوەندی زۆر هەنە ، پارێزەرانی زۆر ... خواوەندی زۆر . خەڵك زۆر ترساون . شتی زۆر لێرە دروستدەکرێن . کەل و پەلی یاریکردنیش دروسدەکەین ... تەختەی یاری کوندار . سەری ئاژەڵەکان دەچێتە ناو کونەکانەوە » .

(( هیچیتر ئەبینی ؟ )) .

« زۆر گەرمە . زۆر گەرم و پڕلەگەردو خۆڵو ... لمە » .

(( لەلاتاندا ئاو نیە ؟ )) .

« با، لەچیاکانەوە دێنە خوار » ئەو قۆناغەی ژیانیشی نامۆنەبوو لەلام.

(( وتت خەڵکی ترساون ، خورافیاتین ؟ )) .

« بەڵێ ، ترس زۆرە . گشت خەڵکی ترساون . منیش دەترسم . پێویستە لەسەرمان خۆمان بپارێزین . پەتاو نەخۆشی بلأوبوەتەوە . ئەبێ خۆمان بپارێزین » .

((چ نەخۆشیەکە ؟ )) .

« بەڵایەکە وەختە هەمووان دەکوژێ . خەڵکێکی زۆر لەگیانەڵادان » .

(( لەئاوەوەیە ؟ )) .

« بەڵێ ، هەوا زۆر ووشکە... زۆر گەرمە ، چونکە خواکان توڕەن و ئەیانەوێ تەمێمان بکەن » مەزهەبی ترسم ناسیەوە ، مەزهەبی (سیریس وهاتور ) .

وەلامەکەشم دەزانی بەلام پرسیم : (( بۆچی خوداکان توڕەن ؟)) .

« چونکە پەیڕەویمان لەیاساکان نەکردووە ، ئەوان توڕەن » .

(( پەیڕەوی چ یاسایەکتان نەکردووە ؟ )) .

« ئەو یاسایانەی کەئەشرافەکان و نەجیبەکان دایان ناوە » .

(( چۆن ئەتوانن خوداکان ئارام بکەنەوە ؟ )) .

« ئەبێ کۆمەڵێ شتی تایبەتی بکەین . هەندێ لەخەڵکی شتی جۆراو جۆر دەکەنە ملیان . ئەو شتانە یارمەتی خراپەکاری دەدەن » .

(( ئایا خودایەکی تایبەت هەیە خەڵك زیاتر لەو بترسن ؟ )) .

« خەڵك لە گشتیان دەترسن » .

(( ناوی هیچ کام لەخواوەندەکان ئەزانی ؟ )) .

« ناویان نابینم ، هەر خۆیان ئەبینم . یەکێکیان لاشەی مرۆڤەو سەری ئاژەڵە. یەکێکیتریان وەکو خۆرو دانەیەکی تر وەك باڵدارێکی ڕەش . گوریسێ دەئاڵێنن لەملیان » .

(( تا کۆتایی ئەم کارەساتە ئەژیت ؟ )) .

« بەڵێ » .

بیرمکەوتەوە : (( بەلام ئەندامانی خێزانەکەت دەمرن )) .

« باوکم ئا ... تەندروستی دایکم باشە » .

(( ئەی براکەت ؟ )) .

بیریکەوتەوە : « براکەم ... ئەو مردووە » .

(( تۆبۆ ئەمێنی ؟ کەسێکی تایبەتی ؟ کاریکی تایبەتت ئەنجامداوە ؟)).

« نەخێر » پاشان باسەکەی گۆڕی . «شتێ ئەبینم ڕۆنی تیادایە » .

(( چی ئەبینی ؟ )) .

« شتێکی سپیە ، لەمەڕمەڕ دەچێ . خۆیەتی ... مەڕمەڕی سپیە ... تەشتێکە ... بەکاری دێنن بۆ ڕۆن مالین ... » .

(( ... بۆ مەزهەبیەکان ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( ئێستە کاری تۆچیە ؟ یارمەتیان ئەدەیت لەئامادەکردنی ئەو ڕۆنەدا؟)) .

« نە نێر ، پەیکەر دروستدەکەم » .

(( هەر لەو بالاخانە قاوەییەدا ؟ )) .

« نەخێر ... لەبالاخانەیەکی تره ... لەپەرستگایەک » بەهۆی شتێکەوە نارەحەت دیار بوو .

(( گرفتت بۆ دروستبووە ؟ )) .

« کەسێ لەپەرستگادا کارێکی کردووە خوداکان تورەبوون . نازانم...».

(( خۆتۆ ئەم کارەت نەکردووە ؟ )) .

« نەخێر... من تەنها مەزهەبیەکان ئەبینم. قوربانی دەکەن . ئاژەڵێک ...بەرانێک. سەریان بێ مووەو کەچەڵن . موو بەسەرو دەمووچاویشیانەوە نییە ... » بێدەنگ بوو ، چەند خولەکێ تێپەڕی و

کتوپڕ گورج بوەوە . دیاربوو گوێی لەشتێ دەگرت . کەهاتەگۆ دەنگی نزم بوو . ڕۆحێکی مەزنی لێبوو .

(( لەم پلەدایە هەندێ لەڕۆحەکان ئەتوانن و مۆڵەتیان پێدراوە خۆیان بەکەسانێ کەهێشتا لەلاشەدان پیشان بدەن . ئەوان مۆڵەتی گەڕانەوەیان هەیە ... بەمەرجێ کارێکی بەناتەواوی جێهێشتبێ . لەم پلەدا دروسکردنی پەیوەندی دوولایەنە مۆڵەت پێدراوە . هەر لێرەوەیە کەدەتوانی بەسود وەرگرتن لەهێزەکانی ڕۆحی خۆت لەگەڵ ئەو کەسانەی هێشتا لەلاشەدان پەیوەندی دروستکەیت . بۆئەنجامدانی ئەم کارەش ڕێگەی زۆر هەیە . بەهەندێکیان هێزێک دەدرێ کەشایانی ڕوئیەت بێ و ئەتوانێ خۆی بەکەسانی جیهانی ماددەنیشان بدات . بەکۆمەڵێکی تریان هێزی بزواندن دەدرێ و دەتوانن خەڵکانێک لەڕێگەی پەیوەندی ڕۆحی و مەعنەویەوە بجوڵێنن . تەنها وەختێ دێتە ئەم پلەیەوە کەئەم کارە سودمەندبێ بۆیان. گەر کارەکانت تەواو کردبێ و ئەوێت وەلانابێ ئەو کات ڕێگە پێدراوی بگەڕێیتەوەو پەیوەندیەک دروسکەیت . بەلام هەر ئەوەندەو بەس ... بۆ ئەم ڕێگەیە پێویستە پەیمان ببەسترێ . کۆتایی هاتنی کتوپڕی ژیان هۆکارێکە بۆچوون بۆئەم پلەیە . زۆربەی ڕۆحەکان ڕۆشتن بۆئەم پلە هەڵدەبژێرن ، چونکە مۆڵەتیان دراوە بەبینینی خزمان و نزیکەکانیان کە هێشتا لەلاشەدان . بەلام پەیوەندی بەهەموو خەڵکیەوە ناکەن . ڕەنگە ئەم کارە بۆهەندێک کەس زۆر زۆر سامناکو مەترسیدار بێت )) کاترین بێدەنگ بوو . وادیاربوو پشوویات . زۆر بەهێمنی هاتەوەگۆ .

(( هێشتا هەردەبینم )) .

پرسم : (( ئەو ڕوناکیە هێزت دەداتێ ؟ )) .

« وەك سەرەتايەكی نوێیە ... لەدايكبونەوەيەكی ترە » .

(( ئەوانەی لەلاشەدان چۆن دەتوانن هەست بەم ڕوناكیە بكەن ؟ چۆن ئەتوانن لەگەڵ دروستبونی ئەو پەیوەندییەدا دووبارە هێز بێتەوە گيانيان؟)).

« لەڕێگەی زەینیانەوە » .

(( ئاخر چۆن ئەتوانی بگەیتە ئەم دۆخە ؟ )) .

« ئەبێ لەئارامیەكی قوڵدا بیت . ئەتوانی بەهۆی ئەو ڕوناكیەوە هێزەكانت نوێبكەیتەوە ... لەڕێی ڕوناكیەوە . پێویستە زۆر ئارام و ئاسودەبیت بەچەشنێ هیچ جۆرە هێزێك بەكارنەهێنی ، بەڵكو نوێی بكەیتەوە . كاتی نوستن هێز نوێ دەكەیتەوە » .

(( چەندجار لەدایك بویت ؟ هەموویان هەرلەم دەوروبەرەدا بووە ؟ لەسەر زەوی یان لەشوێنی تریش بووە؟ )) .

وەلامی داوە : «نەخێر ، هەموویان لێرە نەبوون » .

(( دەچیتە چ پلەو شوێنێكیتر ؟ )) .

« كارێ كەئەبوو لێرە ئەنجامم بایە تەواوم نەكردووە . ناتوانم پێشكەوم ، هەتا هەموو ئەو ژیانانەی بڕیاری لەسەردراوە بۆم ئەزموونیان نەكەم ، وەژیانی زۆر تریشم ماوە ... هەتا گشت كارەكانم تەواو بكەم و گشت قەرزەكان بدرێتەوە » .

(( بەڵام تۆ خەریكە پێشدەكەویت )) .

« ئێمە بەردەوام پێشدەكەوین » .

(( چەند قۆناغی ژیانت لەسەر زەوی بەسەر بردووە ؟ )) .

« هەشتاو شەش » .

(( هەشتاو شەش ؟ )) .

(( بەڵێ )) .

(( هەموویانت لەیادە ؟ )) .

(( بەڵێ ، بەلاّم هەرکاتێ وەبیر هێنانەوەیان بەلامەوە گرنگ بێ )) ئێمە چەند بەشێکمان لەدە یان دووانزە قۆناغ لەژیانەکانیمان بەسەر کردبووەوەو دواجار ئەم قۆناغانە دووبارە دەبوونەوە . وادیاربوو پێویستی بەبیرهێنانەوەی حەفتاو پێنج قۆناغیتر لەژیانەکانی نەبوو . دووبارە دەستیپێکردەوە .

(( هەندێک لەخەڵک بەبەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر دەگەنە پلەی ئاسمانی ، بەلاّم ئەوەی ئەزمونی ئەکەن تێی ناگەن . وەموّڵەتی تێپەڕینیان دەدەنێ )) من پرسیارم لێنەکردبوو دەربارەی مادەی بێهۆشکەر . ئەو لە[illegible]کردنماندا بوو وەهەرچۆن بێ ئێمەی بەشداردەکرد لە[illegible]ستی خۆی.

(( ئەتوانی بۆپێشکەوتنت لێرە سوود لەهێزەکانی ڕۆحی خۆت وەرگر[illegible]؟ وادیارە ڕۆژ بەڕۆژ هێزەکانت پتردەبن )) .

(( بە[illegible] ، گرنگە بەلاّم گرنگیان لەپلەیەکیتردا زۆر زیاترە . ئەمە بەشێکە لە[illegible]ڵبوون و گەشەسەندن ؟ )) .

(( گرنگن [illegible] من و تۆ ؟ )) .

(( گرنگن بۆ [illegible]موومان )) .

(( چۆن ئەتوانی[illegible]ەرە بەم توانایانە بەین ؟ )) .

(( لەگەڵ دروستکر[illegible] پەیوەندیدا پەرەدەسەنی . کەسانێک هەن هێزیان زۆرترە چونکە ب[illegible] زانستێکی زۆرترەوە گەڕاونەتەوە . ئەمانە ئەوانەن کەوەختە پێویستییار[illegible]ەگەشەو یارمەتی دەدۆزنەوە . )) چووە

بێدەنگیـەکی دوورو درێـژەوە . لـەوبارە دەرچـووبوو چـووبووە ژیـانێکی ترەوە.

« ئۆقیانوسـێ ئـەبینم . خانویـە لـەنزیك ئۆقیانوسـەکەدایە سـپیە ، کەشتیەکان زۆر بەکەمی هاتووچۆ دەکەن . ئەتوانم هەست بەبۆنی دەریا بکەم » .

(( تۆلەوێی ؟ )) .

« بەڵێ » .

(( ئەو خانووە چۆن چۆنییە ؟ )) .

« بچوکە ، بورجێ لەسـەرویەوەیەتی ... پەنجەرەیـەکیش کەلێیـەوە ئەتوانی لەدەریا بڕوانی . تەلەسکۆبێکی هەیە ، تەختەیە » .

(( تۆ ئەو تەلسکۆبە بەکاردێنی ؟ )) .

« بەڵێ وەختێ بەدووای کەشتیەکا: دا دەگەڕێم » .

(( ئیشت چییە ؟ )) .

« وەختـێ کەشـتیە بازرگانیـەکان دێنـە بەنـدەر گوزارشـتیان بۆدەکـەین.» بـیرم کەوتـەوە ئـەو لەژیانێکـە تریـدا ئـەم کـارەی کردبـوو ، ئەوکاتەی ناوی ( کرستین ) بوو . کەشتیەوانێك بـوو لەجـەنگێکی دەریاییـدا بریندار بوو بوو .

پرسیم : (( کەشتیەوانی ؟ )) چاوەڕوانی بەڵێی بووم .

(( ئەتوانی بزانی چیت لەبەرکردوە ؟ )) .

« بـەڵێ ، فالینەیـەکی سـپی و پـانتۆڵی کـورت و قـاوەیی و پـێڵاوی ئەڵقەدار ... من دواتر لەم ژیانەمدا دەبمە مەلەوان بـەڵام ئێـستەنیم . »

ئەئـەیتوانی سـەیری ئایـنـدەی بکـات و هـەر ئەمـەش وایکـرد ئـەو زەمەنـە تێپەڕێنێ.

« مـن برینـدار بـووم » دەم و چـاووی دابەیـەکاو لـەتاو دەردو ئـازار گینگڵی دەدا . « دەسـتم زیـانی پێگەیـشتووە » بەڕاسـتی کریـستین بـوو دووبارە ئەو جەنگە دەریاییەی بەسەرکردەوە .

(( تەقینەوە بوو ؟ )) .

«بەڵێ ... بۆنی بارووت دێ » .

کۆتاییەکەیم دەزانی و دڵنیامکرد : « تەندروستیت باش دەبێت » .

ئەو هێشتا پەشۆکابوو : « خەڵکێکی زۆر لەسەرەمەرگدان . چارۆکەکان لەت لەت بوون ... بەشێك لەلای چەپی کەشـتیەکە تەقیوەتـەوە » زیانـە بەرکـەوتوەکانی کەشـتیەکەی تـاوتوێ دەکـرد . « پێویـستە چـارۆکەکان بگۆڕین » .

پرسیم : (( تەندروستیت باشتردەبێ ؟ )) .

« بەڵێ . دروینی پارچەیە بەسەر چارۆکەکانەوە زۆر دژوارە » .

(( ئەتوانی ئیش بەدەستت بکەیت ؟ )) .

« نەخێر ، بەڵام تەماشـای ئـەوان دەکـەم ... چـارۆکەکان لەپارچـەی خێمە دروسکراون . سوژن لێدانی زۆر دژوارە ... خەڵکێکی زۆر مردوون . ئەوان ئازاری زۆریان هەیە » کاترین دەم و چاوی دابەیەکا .

(( چی بووە ؟ )) .

« ئەم ئازارە ... لەدەستمایە » .

(( دەسـتت چـاك دەبـێ . بـچۆرە پـێش لەزەمـەن . ئایـا دووبـارە کەشتیوانی دەکەی ؟ )) .

« بەڵێ » هەڵوێستەی کرد . « ئێمە لە "ویلز" ی باشورین . پێویستە بەرگری لەهێڵمی کەنار ئاو بکەین ؟ » .

(( کێ هێرشتان بۆ دەکات ؟ )) .

(( لام وابێ ئیسپانیەکانن ... ئەوان کەشتی جەنگی زۆرو گەورەیان پێیە)) .

(( دواتر چی ڕوودەدات ؟ )) .

« هەر کەشتی ئەبینم ، بەندەر ئەبینم ، هەندێ دوکان هەنە . لەهەندێ لەدوکانەکاندا شەمع دروسدەکەن . کۆمەڵێ دووکانیش هەن خەڵک کتێبی لێدەکڕن » .

(( قەت چویتەتە لای کتێب فرۆشەکان ؟ )) .

« بەڵێ من ئەوانم زۆر خۆش دەوێ ، کتێب شتێکی باشە ... کتێبی زۆر ئەبینم . ئەو کتێبە سەرەمێژوییە . دەربارەی شارەکان ... وڵاتەکان دەنوسن . نەخشەکانیش هەنە . من خولیای ئەم کتێبەم ... دوکانێ هەیە چەترداره» .

بیری کریستین و ئاوجۆی تاڵ کەوتم : (( شوێنێ هەیە بۆخواردنەوە ؟))

«بەڵێ ، شوێن زۆرە ، ئاوجۆ دەخۆنەوە ئاوجۆی ڕەش ... بەگۆشتەوە... گۆشتی مەڕ لەگەڵ نان ... نانی زۆر گەورە . ئاوجۆ زۆرتاڵە زۆرتاڵ ... هەست بەتامەکەی ئەکەم . شەرابیشیان هەیە لەگەڵ مێزی تەختەو درێژ ... » .

بڕیارمدا بەوناوەوە بانگی بکەم و کاردانەوەی ببینم . بانگم کرد :

(( کریستین ! ))

گورج وەڵامیداوە : «بەڵێ ! چیت ئەوێ ؟ » .

(( کریستین! ماڵەوەتان لەکوێن ؟ )) .

« لەشاری ( همجوار ) . ئێمە لەڕێگەی دەریاوە بۆ ئەوشارە ئەچین ».

(( کێ لەخێزانەکەتاندا هەیە ؟ )) .

« خوشکێکم هەیە ... ماری » .

(( هاوڕێ کچەت لەکوێیە ؟ )) .

« نیمە ، تەنها ئافرەتانی ناوشار » .

(( هیچ کەسێ بەتایبەتیش ؟ )) .

« نەخێر، تەنها ئافرەتان ... گەڕامەوە بۆدەریا . لەزۆرجەنگدا بەشداری ئەکەم بەڵام لەئاماندام » .

(( پیرئەبیت ... )) . « بەڵێ » .

(( ژن ئەهێنی ؟ ))

« پێموابێ ئا . مستیلەیەئەبینم » . (( منالت هەیە ؟ )) .

« بەڵێ ، کوڕەکەشم دەریاوانی ئەکات . مستیلەیە هەیە ، مستیلەو دەستێ . دەستێکە شتێکی گرتووە . ناتوانم بزانم چییە . مستیلەیە بەشێوەی دەست دەبینم ، دەستێکە شتێکی توند گرتووە. » کاترین هێڵنجی هات . (( چی بووە ؟ )) .

« دانیشتوانی کەشتیەکە نەخۆشن ... بەهۆی خۆراکەوەیە ، خواردنێکمان خواردووە خراپ بووە ، گۆشتی بەرازو سوێرا» دڵتێکەڵدان و هێڵنجدانی بەردەوام بوو . لەزەمەن بردمەپێش و ئەو بارەی نەما . بڕیارم دا دووبارە سەکتەی دڵەکەی کریستین نەبینێ . ماندوبوو لەبەرئەوە بێدارم کردەوە لەهیپنۆتیزم .

له دوای سێ هه‌فته ، دووباره یه‌کترمان بینیه‌وه . نه‌خۆشی و په‌تا کاتیه‌کانم و مه‌ره‌خه‌سی ئه‌و بوبووه هۆی ئه‌م دوا که‌وتنه . له‌م ماوه‌دا کاترین شادو و خۆشحاڵبوو ، به‌ڵام هه‌رئه‌وه‌نده‌ی کارمان ده‌ستپێکرد گوج شڵه‌ژا . وتی هێنده باش بووه که‌پێی وانیه هیپنۆتیزم زیاتر له‌مه یارمه‌تی بدات . ڕاستیشی ده‌کرد . له‌دۆخێکی ئاسایدا بوو ، پێده‌چوو له‌هه‌فته‌کانی دواتردا ڕه‌وشی ده‌رمانمان ڕاگرتایه . به‌ڵام به‌هۆی دوو هۆکاره‌وه به‌رده‌وام ب...ین ، یه‌که‌میان من هۆگری په‌یامی ڕۆحه مه‌زنه‌کان بو... و، دووه‌م هێشتا چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌کی زۆرلاوه‌کی له‌ژیاندا مابوون . تا ڕاده‌یه کاترین تیماری ده‌ردی کرابوو قۆناغه‌کانی ژیانی دووباره ده‌بوونه‌وه . به‌ڵام نه‌کا ڕۆحه مه‌زنه‌کان په‌یامی تریان بۆ من هه‌بوایه ئه‌وسا به‌بێ کاترین چۆن ده‌متوانی په‌یوه‌ندیان پێوه بکه‌م ؟ ئه‌مزانی ئه‌گه‌ر پێداگریم کردایه له‌سه‌ری به‌رده‌وام ده‌بوو به‌ڵام هه‌ستمکرد پێداگری کارێکی باش نییه . هه‌رچه‌ند پێی بێتاقه‌ت بووم به‌ڵام ڕازی بووم . باسمان له‌ڕووداوه‌کانی سێ هه‌فته‌ی ڕابردوکرد به‌ڵام من دڵم له‌جێیه‌کی تربوو .

پێنج مانگ تێپه‌ڕی . ته‌ندروستی کاترین هه‌روا باش بوو . ترس و دڵه خورپێکانی به‌ته‌واوی که‌م بوو بوون . ژیان و په‌یوه‌ندیه‌کانی باش بوون . هێشتا په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ئیشتوارت پاراستبوو . هه‌رچه‌نده له‌گه‌ڵ خه‌ڵکی

تریشدا دیداریان هەبوو . بۆیەکەم جار لەمنالیەوە هەستی بەشادی و خۆشی ڕاستەقینە دەکرد . هەرکات ناکاتێ یەکترمان لەسالۆن یان لەکافتریا دەدی . بەڵام پەیوەندییەکی ڕەسمی نەخۆش و پزیشکمان نەبوو .

زستان تێپەڕیکردو جێگای خۆیدا بە بەهار . کاترین وادەی دیدارێکی لە عیادەکەم دانا . چەند جارێك خەوی دەربارەی قوربانیەکی مەزهەبی دیبوو. لەخەوەکەیدا هەندێك مار لەناو چاڵێکدادابوون و خەڵك ئەمیشیان تورِ دەدایە ناو ئەو چاڵەوە . ئەو لەناوچاڵەکابوو ، هەوڵی ئەدا بەدەسکردن بەناو دیوارە بەردەڵانەکەدا بێتە سەر . مارەکانیش لەژێر پێیدابوون و لەم کاتەدا توشی هەراس و دڵە خورپە دەبێ و لەخەو ڕادەپەڕێ .

لەگەڵ ئەوەی ماوەیەکی زۆر مەودای دانیشتنی هیپنۆتیزمان هەبوو، بەزووی چووە خەواندنەوە . سەیر نەبوو بەلامەوە کە خێرا گەڕابوەوە بۆ یەکێك [1] ژیانە کۆنەکانی .

«لەشوێنێکم زۆر گەرمە . دوو پیاوی ڕەش ئەبینم لەنزیک دیوارە ساردو شێدارە بەردینەکان وەستاون . شتێ بەسەر سەریانەوەیە . خەریکی دروستکردنی عەمبارەکانن لەبەردو گڵو جۆرێ گەنمی خراپبووی تیا دادەنێن . شتەکان لەئەسپ وعەرەبانەیەکی تایە ئاسن دەهێنن . حەسیرەکانیش بەسەرعەرەبانەکانەوەیە . ئاو ئەبینم ، زۆر شینە . ئەو کەسەی بەرپرسە فەرمان بەوانیتر دەدات . شوێنێکە دانەوێڵە دادەکەن، سێ پلیکانە بەرەو خواروی هەیە . پەیکەری خواوەندێ لەدەرەوەیە . سەری باڵدارو لاشەی مرۆڤە . ئەوەش خواوەندی وەرزەکانە ».

«دیوارەکان بەقیر سواق دەدەن تا کەلەبەری هەوابگرن و دانەوێڵەکە بەتازەیی و پوختی بمێنێتەوە . دەموچاوم دەخورێ ... ڕشتەی ڕەنگ شین

لەموەکانما ئەبینم . مێش و مەگەزەکان دەبنە هـۆی ئاڵۆشـی دەسـت و دەم و چاوم. شتێکی لکاو دەنێم بە دەموو چاوما تا لەخۆمیان دروخەمـەوە ... بۆنی زۆر ناخۆشە ، شیری جۆرە درەختێکە )) .

((قژەکانم پەلکن و ڕەشن . من لەئەندامانی خێزانێکـی بەدەسـەڵاتم . بەهۆی میوانیو دەعوەت و بۆنەیەکەوە لەوێم . هاتووم تـا ڕێـو ڕەسمـی (تدهین)* ی مەزهەبیەکان ببینم . جـەژنێ بـۆ خودایـان بەبۆنـەی هـاتنی وەرزی بەرو بووم . بەتەنها ئاژەڵان دەکرێنە قوربانی نـەک مرۆڤـەکان . خـوێنی قوربانیـەکان لەسـەکۆوە دەچـێتە جۆگەیـەک و دەرژێتـە نـاو سـتونێکەوە . پیـاوان کـڵاوی بـچوک و ئاڵتونیـان لەسـەردایە . گـشتیان پێستیان تارە . ئێمە هەنـدێ خـەڵکمان لـە وولاتـانی تـر هەیـە لەوپـەڕی دەریا...)) ئەو بێدەنگ بوو منیش چاوەڕوان بـووم . هەستمدەکرد یەکـەم دانیشتنی دەرمانە. وادەردەکەوت گوێ لەشتێ دەگرێ .

((شتەکان خێراو ئاڵۆزن ... ئەوەی ئەوان پێمان دەڵـێن ... دەربـارەی گۆڕان و گەشەو پلەی جیاوەزە . یەک پلەی ئاگایی و پلەیەکی گواستنەوە هەیە . ئێمە لەقۆناغێکی ژیانەوە دێین ، ئەگەر وانەکانمان تـەواو بـووبن دەچینە ڕەهەندێکی ترو ژیانێکی ترەوە . پێویستە لەسەرمان تەواو لێیـان تێبگـەین . گـەر تێنەگـەین ، مۆڵـەتی تێپـەڕینمان نییـە ... لەبەرئـەوەی فێرنابین پێویـستە دووبـارەی کەینـەوە . پێویـستە هـەموو بوارەکانمـان ئەزمون کردبێ . ئەبێ بزانین کەئەگەر خواستن هەیە ئـەوا بەخـشینیش هەیە ... شتی زۆر بۆ فێربـوون هەیـە ، ڕۆحـی زۆر دەرگـیرن . بـەهۆی ئەمەوەیە ئێمە لێرەین . ڕۆحە مەزنەکان ... تەنها گروپێ لەڕۆحەکان لەم پلەدان )) .

کاترین بێدەنگ بوو ، پاشان بەدەنگی ڕۆحە شاعیرەکە هاتە دوان .

«ئەوەی پێتی دەڵێن لەپێناو چۆنیەتییە. ئێستە ئیتر پێویستە لەسەرت لەڕێگەی دەرخستنی بەڵگەکانەوە فێرببیت » .

پاش چەند خولەکێ وتی : «محاجەرەیەکی ڕەش دەبینم ... لەوناوەدا گۆڕی زۆری لێیە . گۆڕی تۆش لەوێیە»

سەرسام بووم و پرسیم : ((گۆڕی من ؟))

«بەڵێ » .

((دەتوانی نوسینەکەی بخوێنیتەوە ؟ )) .

«ناوی انۆبلاه : ۱۶۶۸-۱۷۲٤ . گوڵێکی لەسەرە ... لەفەرەنسا یان ڕوسیایە . قاتێکی سوورت لەبەرکردبوو ... لەسەر ئەسپ کەوتویتە خوارێ ... بازنەیەکی ئاڵتون هەیە ... لەگەڵ سەری شێرێکدا ... وەکو ناونیشان بەکار دێ » . ئیتر شتێ نەبوو . گوتەی ڕۆحە مەزنە شاعیرەکەوە تێگەشتم کەچیدی شتێکی ئەوتۆ لەڕێگەی هیپنۆتیزمی، کاترینەوە دەست نادات . ڕاستیەکەی هەرواش بوو . ئیتر بڕیار نەبوو دیدارمان هەبێ . دەرمانکردنی تەوواو بوو بوو وەئەوەی کەپێویست بوو لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوەکان فێری بم، فێر بوو بووم . ئەوەی مابوو لەئایندەدا ، ئەبوو لەڕێگەی دەرخستن و بەڵگەوە فێری بوومایە .

---

*تدهین مەراسیمێك بووە مەزهەبییەکان ئەنجامیان داوە وەك چەورکردن و مەرهەم کردنی لاشەی مردووەکان و شتی تریش.

دوومانگ پاش دووا دیدارمان ، کاترین تەلەفۆنی کردو وادەیەکی دیداری دانا . وتی کەدەیەوێ شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشم پێبڵێ .

وەختێ پێی نایە ناو عیادەکەمەوە سەرسام بووم لەکاترینێ کەشادی و خەندە بە لێوەکانیەوە لەناخی دەروونیەوە نمایان بوو . بیرم لەو کاترینـەی ڕابردوو کردەوە کەلەماوەیەکی کەمدا چەندە گۆڕابوو .

کـاترین چـووبوو بـۆ دیـداری (ئـایریس سـالتزمن) کەئەسـتێرە ناسـی بـەناوبانگ و پـسپۆڕی خوێندنـەوەی ژیانـەکانی پێـشوو بـوو. مـن کـەمێك سەرسـام بـووم ، بـەڵام دەرکـم بـەگومان و نیـازم بەپـشت ڕاسـتکردنەوەی ئەوەی کاترین ئەزموونی کردبوو هەبوو. خۆشحاڵ بـووم لـەوەی کـەدڵنیابوو لەسەرئەنجامی کارەکە .

کاترین دەربارەی ئایریس هەندێ شتی لەهاوڕێکەیەوە بیـستبوو ، ئـیتر بەبێ ئەوەی دەربارەی ئەمەی لەعیادەکەمدا ڕوویدابوو بدوێ ، تەلەفۆنی بۆ کردبوو وادەی دیداری دانابوو .

ئایرس بەتەنها بەرواروو شـوێن و کـاتی لـەدایك بـونی لێپرسـیبوو . ئـیتر وتبووی کەلەگەڵ ئەم زانیاریە سەرەتاییانەدا جەریخکی نجومی دەخولقێنێ و لەگەڵ ئیلهاماتی خۆیدا دەتوانێ جورئیاتەکانی ژیانـەکانی پێـشووی کـاترین دەربخات .

ئەمە یەکەمین ئەزموونی کاترین بوو لەگەڵ وەها کەسێکدا . نەیدەزانی دەبێ چاوەڕوانی چی بکات . بەڵام پاشان تێگەیشت کە ئایریس زۆربەی ئەو شتانەی کەلەژێر هیپنۆتیزما دەرکەوتوون ئیعتباری پێدەدات .

ئایرس لەگەڵ قسەکردن و یاداشتکردن لەسەر خشتەیەکی نجومی کەلەویا دروستی کردبوو، وورده وورده خۆی بردبووه بارێکی گۆڕاوەوە . پاش چەند خولەکێ لەچونە ناو ئەم دۆخەوە دەستی بردبوو بۆ گەروی و وتبوی کە کاترین لەیەکێك لەژیانەکانی ڕابردوویدا بەهۆی برینی گەرویەوە کوژراوە . ئەمە جگە لەمەی کەبرینی گەرووی لەجەنگێکدا ڕوویداوەو ئایریس دەیتوانی کلپەو وێرانی لەدێهاتێ لەسەدەکانی ڕابردوودا ببینێ . وەگوتبوشی ئەم کاتە هاوکات بووە لەگەڵ ئەوەدا کە کاترین پیاوێکی گەنج بووە .

دواتر کە ئایریس کات[illegible]بنی بەناونیشانی پیاوێکی گەنج لەجل و بەرگی هێزی دەریایدا ناساندبوو چاوەکانی درەوشاوونەوە . کتوپڕ ئایریس دەستی چەپی گرتووەو هەستی بەئازارێکی توند کردوەو گووتبوی کەشتێکی تیژ چووە بەدەستیاو جێگای برینێکی نەبڕاوەی تیادروست کردووە . پاشان جەنگی دەریای گەورە هەبووەو ناوچەکەیان دوور لەکەنار ئاوی بەریتانیا بووەو دواتریش کەوتبووە باسکردنی ژیانی دەریاوانی .

ئایریس چەند بەشێ لەقۆناغەکانی ژیانی کاترینی باسکردبوو . ژیانێکی کورت لەپاریس کەتیایدا کاترین کوڕێکی هەژار بوو جوانە مەرگ بوو بوو . لەزەمەنێکی تردا ئافرەتێکی سور پێستی ئەمریکایی لەکەنار ئاوی ڕۆژئاوای فلۆریدابووە ، لەم قۆناغەیدا پزیشکێکی محەلی بووەوە بەپێخاوسی هاتووچۆی کردووە . ئەو پێستی تیرەو چاوی تەلیسماوی بوون و حاڵەتی

زۆر ڕۆحانی هەبووەو مەرهەم و دەرمانی گیایی دروست کردوەو دواتریش حەزی لەگەوهەرێکی بەنگینی شینی جوان بووە .

کاترین لەقۆناغێکی تری ژیانیا ئافرەتێکی داوێن پیسی خەڵکی ئیسپانیا بووە . یەکەم ووشەی ناوی بە (ل) دەست پێدەکات و لەگەڵ پیاوێکی گەورەتردا ژیاوە .

لەژیانێکیکەدا کچی نامەشروعی پیاوێکی دەوڵەمەند بووە . گووتبوی زۆر جوان و پەنجە شمشاڵی بوەو هەر بە منداڵی دراوە بەشوو . کاترین ئاژەڵو بەتایبەت ئەسپی خۆش ویستوەو باش بووە لەگەڵیاندا لەچاو مرۆڤەکانیتردا .

لە ژیانێکی تری کورتدا پیاوێکی مەراکیشی بووەو بەنەخۆشییەك لەگەنجیدا مردوە . ماوەیەکیش لەکاری جادووگەریدا بووە .

لەژیانێکی قەدیمیدا خەڵکی میسر بوەو کاری ئەسپەردەکردنی رێورەسمی مەزهەبی ئەو کلتوورە بووە .

هەروەها چەندین ژیانی لە ئیتاڵیاو لە فەرەنسا بووە . لەیەکێك لەوانەدا لە (فلۆرانس) ژیاوەو دەستی لەکارە مەزهەبییەکاندا هەبووەو، پاشان چوەتە سویدو ئافرەت بووەو دوو کوڕی هەبووە . خولیای ئاڵتوون و گەوهەر بووەو خاچێکی ئاڵتوونی هەبووە . لە فەرەنساشدا لەجێیەکی ساردو شێداردا زیندانی بووە .

لەژیانێکی تردا ، کاترین پیاوێکی یابانی بووەو لەکاری ڕۆشنبیری و کتێبدا بووەو زۆر زانا بووە .

وەدواجار لەقۆناغێکی نوێتر لەژیاندا ، سەربازی ئەڵمانی بووەو لەجەنگا کوژراوە . من جەزبی ڕاستی جوزئیاتەکانی ئەم ژیانانەو بەو چەشنەی

ئاپریس باسیکردبوو بوو بووم . چوونیەك بونیان لەگەڵ یادەوەری لەگەڵ خودی کاترین لەکاتی هیپنۆتیزما دڵ تەزێن بوو . بریندار بوونی دەستی کاترین لەجەنگی دەریاییداو .......

هەندێ خاڵی لێکچوو هەبوون لەنێوان ژیانەکانی ڕابردوو ئێستای کاتریندا.

بۆ نمونە کاترین شەیدای بەردی قەدیم و شین بوو، ئەو هەمیشە ئاژەڵەکانی خۆش ویستوە بەتایبەت ئەسپ و پشیلەو زیاتر لەگەڵ ئەواندا هەستی بەئاسایش و ئەمنیەت کردووە تا لەگەڵ مرۆڤەکان .

مــن هـەرگیز ئـەم کـارە بـەکارێکی زانـستی بـاوەڕ پێکـراو نـازانم . نەمدەتوانی لەهیچ ڕێگەیەوە ئەو گۆڕانکاریانە کۆنترۆڵ بکەم بەڵام ئەم شتە ڕویدابوو پێم وابوو گێڕانەوەی لێرەدا گرنگی خۆی هەیە .

زۆر دڵنیا نیم لەو ڕۆژەدا چی ڕوو داوە . پێدەچێ ئاپریس بەشێوەی نائاگا سودی لەپەیوەندی ڕۆحی وەرگرتبێ و زەینی کاترینی خوێندبێتەوە . چونکە یاداشتەکان لە زیهنی کاتریندا هەبوون . یان ڕەنگە خۆشی توانیبێتی ئەو زانیاریانەی چنگکەوتبێ . بەهەرچەشنێ دەستیکەوتبن هەردوو لێکچوون . ئەوەی کاترین لەڕێگەی هیپنۆتیزمەوە دەستی کەوتبوو ئاپریس لەڕێی کەناڵەکانی ڕۆحیەوە چنگیهێنابوو .

چوار ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ئەم ئەزموونە ناوازانەداو ئەم ئەزموونە هەردووکمانی بەتەواوەتی گۆڕیووە.

جارجارە بۆ هەواڵپرسین یان دوان دەربارەی گرفتێکی خۆی سەردانم دەکات لەعیادەکەم. هەرگیز داوای هیپنۆتیزمی نەکرد لەوەلانان یان تێگەیشتنی ئەوەی کەسانی نوێی ژیانی ئێستەی لەڕابردوودا چ پەیوەندییەکیان لەگەڵی هەبووە. کاری ئێمە کۆتایی پێهاتووە. ئێستا کاترین ئازادە تا بەتەواوی چێژ لەژیانی ببات. وەها هەست بەڕازیبوون و شادومانی دەکات کە خۆشی گاڵتەی لێدەهات. ئیتر لەنەخۆشی یان لەمەرگ نەدەترسا. ئێستا لەهاوسەنگی و ن ەماهەنگی دا وەخت دەباتەسەرو ژیانی ماناو مەبەستی خۆی تەیدەکات. تەنانەت لەئارامییەکی وەهادایە کەخەڵك زۆر خوازیارین بەڵام کەمێکیان بەدەستیان دەگات. هەست دەکات ڕۆحانی تربووە. هەموو ئەوشتانەی ڕویانداوە بەلایەوە ڕاستەقینەن. کاترین مەیلی لەموتاڵاکردن و گەڕان نییە لەزەمینەی ڕۆحیداو هەستدەکات شتێك دەزانێ کە کتێب وقوتووی هیچ عەتارێکدا نییە. خەڵکانێك کەخۆیان یان ئەندامانی خێزانەکەیان لەسەرەمەرگدان بەدوای کاترینەوەن. کاترینیش لەگەڵیان دادەنیشێ و دەیاندوێنێ و ئەوانیش باشتر ئەبن. سەرەڕای ئەوەی دەستکەوتەکانی ژیانی منیش هێندەی ژیانی کاترین گۆڕاوە.

هەست و نەستم زۆر بەهێز بوون. ئاگایی زۆرترم هەیە لەڕەهەندی نادیاری کەسایەتی نەخۆشەکان و هاوکاران و دۆستانم. واهەستدەکەم

دەربارەیان پتر لەوەی ئەشێ بیزانم دەزانم. بەهاو ئامانجەکانی ژیانم زیاتر مرۆیی و کەمتر مادی بوون. هۆکارەکانی چارەسەرو شیفا دەران و خەڵکانێ کەخاوەنی هێزی ڕۆحین زیاتر لەژیانما خۆیان ئەنوێنن. بەبەرنامەی وردو درشتەوە دەستم داوەتە لێکدانەوەیان. "کارول"یش وەك من گەشەی کردوەو بەتایبەت لێهاتوو بووە لەڕاوێژەکانی سەبارەت بەمەرگ و مردن، وەبەڕێوەبەری گروپی پاڵپشتی توشبوو بە نەخۆشی ئایدزە.

دەستمکرد بە مەدیتەیشن ، کارێك تاماوەیە لەوەبەر وام ئەزانی تەنها هیندیەکان و خەڵکی کالیفۆرنیا ئەیکەن. ئەو زانیاریانەی لەڕێگەی کاترینەوە بۆم هاتوون بوەتە بەشێك لەژیانی ڕۆژانەم . هێمن و بەبەزەیتر بووم. هەست بەبەرپرسیاری زۆرتر ئەکەم لەبەرامبەر کارەکانما. ئەزانم کەپێویستە بۆ هەر زانستێ بەهایەك بدەی. ئەزانم کە: (( هەرچی بکەی بۆخۆتی ئەکەی، گەر هەموو باشەو خراپ یەبکەی)).

ئێستەش هەرووتاری زانستی دەنوسم، لەکۆبونەوە پسپۆڕیەکاندا دەدوێم و بەڕێوەبەری بەشی دەوونناسیم. بەڵام ئێستە هەنگاوەکانم لەدوو دونیایە: دوونیای پەیوەندیدار بەهەست، کەئەمەش لاشەو پێویستییە مادییەکان بەیانگرینی، وەدونیای گەورەتری مەعنەوی کەڕۆح و زەینمان نومایان گرینی. ئەزانم ئەم دوو دونیایە پەیوەندییان پێکەوە هەیەو هەموو شتێ بریتیە لەهێز، بەڵام سەرباری ئەوە مەودایان زۆرە لەگەڵ یەك. کاری من پەیوەندیکردنی ئەم دونیایانەو سەلماندنیەتی بەووردی و بەشێوەیەکی زانستی.

خێزانەکەم شکۆفاون. کارول و ئیمی خاوەنی توانایەکی ڕۆحی گەورەن. منیش سەختگیرییەکانم کەمتربوون . هەندێجار خەوی نائاسایی ئەبینم.

لەماوە چەند مانگێ پاش دانیشتنەکانی کاترین نیازی سەیر لەخەوەکاناما دەردەکەوتن. هەندێجار ، خەوی دیارم ئەبینی و لەخەوەکەمدا یان گوێبیستبووم یان پرسیارم لێدەکرن. ناوی مامۆستاو وتەبێژ "فیلۆ" بوو. زۆر جار کەخەبەرم دەبۆوە هەندێك لەو قسەو باسانەم بەبیر دەهاتن و دەمنوسین. هەندێکیان لێرەدا دەنوسم. یەکەمجار وتەبێژێك بوو کەمن دۆخی پەیامی ڕۆحە مەزنەکانم تیا دەدی.

«... زانستی زەینی بەسانایی وەچنگدێ، بەڵام پێویستە بگۆڕدرێ بەزانستی "هەستی". کەئەم ئاڵوگۆڕە ئەنجامدرا کاریگەرییەکەی هەمیشەییە. پرۆڤەی رەفتار کارای پێویستی ئەم گۆرانەیە. بەبێ کردار ئەم چەمکە ڕەنگی نامێنێ و لەناو دەچێ. زانستی توێری بەبێ بەکارهێنانی زانستی بەس نییە ».

« ئەمرۆ خەڵکی ''هاوسەنگی و هەماهەنگی بێئاگان، ئەمە لەکاتێکدا ئەمانە بنەمای دانایین. لەگشت کارەکاندا زیادەرەوی دەکرێ. خەڵك کێشیان قورسبوە چونکە زۆر دەخۆن. هەڵپەکارانی گشت بوارەکان بوونی خۆیان و بەرامبەریان لەبەرچاو ناگرن، چونکە زیادەرەوی دەکەن لە هەڵپەکردنا. خەڵك زیاد لەسنور ناپاك بوون، زۆر ئەنۆشن، زۆر جگەرەئەکێشن، مەی زۆر ئەخۆنەوە، قسەی گەندو هەلەق و مەلەق زۆر دەکەن و زۆر نیگەرانن. ئەمەرەوشێکی سروشتی نییە».

« سروشت هاوسەنگی هەیە. ئاژەڵە درندەکان بەرێژەیەکی کەم ئەوانیتر لەناو دەبەن. سیستمە ئیکۆلۆژی( زانستی ژینگەزانی ) یەکان بەکۆمەڵ لەناو ناچن. گژو گیاکان بەکاردەهێنرێن و دووبارە دەروێنەوە.

سەرچاوەکانی ژیان کەم و دووبارە زۆرئەبن. چێژ لەگوڵ وەردەگیرێ و میوە ئەخورێ و ڕیشەکەی هەر ئەمێننەوە».

« زۆربەی فێری هاوسەنگی نەبووە جاهەیدێ لەوەی کاری پێبکات. تەماع و بەرژەوەندی خوازی ڕێنومایی کەریەتی و ترسیش دەستگری. بەم ڕەوتە، دواجار خۆت لەناو دەبەیت. بەڵام سروشت وەك خۆی دەمێنێ، هیچ نەبێ گیاکان وەك خۆیان دەمێننەوە».

« ڕیشەی شادومانی لە سادەیی دایە. حەزکردن بەزیادەڕەوی لەئەندێشەو کرداردا، لەشادومانی کەمدەکاتەوە. زیادەڕەوی، سێبەر لەسەر ئەرزشەکانی بونیاد دەکات. پیاوانی مەزهەبی و ئاینی بڕوایان وایە کە شادی بەرهەمی سارێژبوونی دڵە لەعیشق ، ئیمان و ئومێدو خێرخوایی و میهرەبانی. ئەوان ڕاستئەکەن. ئەگەر ڕەفتارمان وەها بێت، پەیامی ئەو هاوسەنگی ، هەماهەنگی ئەبێت. ئەمڕۆکە ئەمشتانە لەگۆڕاندان. وەك ئەوەیە ئادەمی ، وەختێ لەسەر زەوییە لەدۆخی سروشتی خۆیدا نییە. ئاستی ئاگایی مرۆڤ دەبێ بگۆڕێ تاخۆی لە عیشق و خێرخوایی و سادەیی لێوانلێوکات، هەست بە پاکی بکات و لەترسە نەبڕاوەکەی قوتاری بێ».

« چۆن مرۆڤ بەم دۆخە گۆڕاوەوە دەگات بەم سیستەمە بەها جیاوازە؟ وەکاتێ پێبگەیی، چۆن دەتوانێ پارێزگاری لێبکات؟ ڕەنگە وەڵامەکەی سانا بێت. گشت ئاینەکان لەگەڵ ئەم بڕوایەدان کە ئادەمی فەنا بوونی نییە. ئەوەی ئێمە ئێستا ئەنجامی ئەدەین فێربوونی وانەکانی ژیانمانە. ئێمە هەموومان لەخوێندنگەدایین. ئەگەر بڕوات بەنەمری هەبێ، ئەم مەسەلە زۆر سادەیە».

(( ئەگەر بەشێ لە بوونی مرۆڤ نەمرە، وەبەڵگەی زۆر هەیە بەم چەشنە بیرکەینەوە ئەی بۆچی هێندە کاری خراپ ئەنجامئەدەین؟ بۆچی لەبەر بەرژەوەندی خۆمان گورزلەخەڵکی دەوەشێنین؟ دواجار هەموومان بۆ یەک جێگەو ڕێگە دەچین، بەڵام بەخێرایی جیاواز. کەس لەکەس باشتر نییە )).

(( گرنگی بەوانەکانی ژیانت بدە. هەمیشە وەڵامەکان تیایاندا شاراوەیە. بەڵام کلیلی فێربوون لەڕێگەی ئەزموونکردن و کارکردنە پێیان. زانینی فەرمانە ئاینی و مەزهەبیەکان بەس نییە. گوفتاری بێکردار بێبەهایە. قسەکردن دەربارەی عیشق و خێرخوایی و ئیمان ئاسانە. بەڵام کارکردن بەوانەو دەرککردنیان پێویستی بە ئاڵوگۆڕی ئاگایی هەیە، نەک بەدۆخی کاتی مادەی کحول و بێهۆشکەر. یان لەلایەن حەماسیەتێکی چاوەڕوانەکراو دروست نابێت. بەزانست و تێگەیشتن ئەتوانی ئەودۆخانە بپارێزی، بەرەفتارو کردارو پرۆڤە. ئەم دۆخانە هەناوین و بەپرۆڤەی ڕۆژانە فێرئەبن)).

((بزانن هیچ کەس لەویتر گەورەتر نییە. هەست بەم فەرمانە بکە. یارمەتی خەڵکی بە. لەبیرتان بێت ئێمە هەمووومان لەبەلەمێکدا سەوڵ لێدەدەین)).

شەوێکی تر لەخەوما پرسیم: (( چۆن چۆنییە کە دەڵێی هەمووان چونیەکن، بەڵام ئەم دژەو پێچەوانانە گورزمان لێدەدات: نابەرامبەری لە زانست وزانیاری، ڕەوشت، سەروەت و سامان، ماف و تواناو لێهاتویی، هۆش و توانای وەرزشی و ...؟))

وەڵامەکە وێکچاندن بوو. « وەک ئەوەوایە لەناخی هەرکەسێکدا ئەڵماسێکی گەورە هەبێت. ئەڵماسێ بێنە بەرچاوت کە سێ سانتیمەتر درێژەو هەزار ڕوی داتاشراوی هەیە، وەئەم داتاشراوانە لەغوبارو تۆز داپۆشراون. ئیشی ڕۆح پاکردنەوەی ڕوەکانییەتی بەچەشنێ کە ئەڵماسەکە بدرەوشێتەوەو بتوانێ حەوت ڕەنگەدرووستبکات لەڕەنگەکاندا».

« هەندێک زۆر ڕویان پاکردۆتەوەو بەڕۆشنی دەدرەوشێنەوە. خەڵکانێک توانای پاکردنەوەی چەند ڕوویەکیان هەبووەو زۆر نادرەوشێنەوە. بەم پێیە، ناهاوسەنگی هەرمرۆڤێ لەژێر غوبارو تۆزدا ئەڵماسێک بەهەزار ڕووی درەوشاوە هەیە. ئەڵماسەکە کامڵەو بێ کەمو کوڕییە، تەنها جیاوازی یەکێک لەوانیتر لەڕێژەی ژمارەی پاکۆبووی ئەڵماسەکەی نا ؛بانە. بەڵام گشت ئەڵماسەکان یەکێکن و هەردانەیە ان بگری بێکەموکوڕییە».

هەندێجار پرسیارەکان ئاڵۆزو وەڵامەکان سادەن.

لەخەوێکدا پرسیم: (( من دەبێ چی بکەم؟ ئەزانم لەتوانامدایە خەڵکی نەخۆشم تیمار بکەم، ئەوان زۆرن و کەدێنە لام ناتوانم گشتیان بگرمە ئەستۆ. زۆرماندووم. بەڵام ئایا ئەتوانم وەختێ کەئەوان هێندە پێویستیان پێیەتی و منیش توانای یارمەتی دانیانم هەیەو بڵێم نا؟ ئایا ڕاستە بڵێم نا)).

لەوەڵامدا وتی: « ڕۆڵی تۆ ئەمە نییە ڕزگارکەری نوقم بووەکان بی».

دوانمونەیە کەئەینوسم پەیامێك بوو بۆ پزیشکانی دەرونی. نزیکەی شەشی بەیانی بوو لەخەوێ کەتیایدا دەدوام و گوێگرانم پزیشکانی تری دەرونی بوون، بەخەبەر هاتم.

(( پەلـە نـەکردن لەئاراسـتەی پزیـشکی دەروونـی و رەھانـەکردنی زانیارییە سوننەتیەکان بۆ پیشەکەمان زۆر گرنگن، ئەگەر چی لە ھەندێک شتا ئەم زانیاریانـە نادیـارو ئـاڵۆزبن. ئێمـە خـەڵکێکین کەھێـشتا لەگـەڵ نەخۆشەکانمان بەھەستی ھاودەردییەوە دەدوێین. ھەتا ئێستەش لـەپێناو ئەم کارەدا وەخت ئەبەینە سەر. ئێمە لـەبری بـەکار ھێنـانی "لـەیزەر" ھەوڵئەدەین بەدەرککردنی ھۆکانی نەخۆشیەکان و ھانـدان بەخۆناسـی و ئومێدەواری، نەخۆشییەکان تیمار کەین)).

(( لەم چاخەدا، لقەکانی پزیشکی تر ، ڕەوشە سوننەتییەکانی دەرمانی زۆر بەناتەواو و وەختگرو بێ سوود دەزانن. ئەوان جەختدەکەنەوە لەسەر تەکنە لۆژی نوێ و، پشکنینی خـوێن بەکۆمپیوتـەر لەچـاو پـشکنینی تاکـە کەسی. ڕەوشەکانی ئامانجخوازی و ڕەوشتی کەگرەنتی ڕازیبـونی کەسـە لەپزیشکیدا، جێی خۆیداوە بەڕەوشـەکا ی ئـابوری و کـاراو لـەناو بـەری ڕەزامەندی خەڵکی. سەرەنجام ھاوکارانمان ، ڕۆژ بـەڕۆژ زیـاتر جـاڕس و گۆشـەگیرتر ئـەبن و نەخۆشـەکان ھەسـتدەکەن گرنگییـان پینـادرێ و کارەکانیان بەپەلە بۆئەنجام دەدرێ)).

(( نابێ ئێمە فریوی تەکنەلۆژی نوێ بخۆین. پێویـستە لـەبری ئـەوەدا ببینە نمونەیە بۆھاوکارانمان. ئەبێ نیشانی بدەین کەچۆن چۆنی پێویـستە وەختێکی زۆرتر بەرینە سەر لە قسەکردن، فێرکردن، ئومێـدەوارکردن و چاوەڕوانی باش بوون بکەین. ئەمانە تایەبەتمەنـدی گـەلێکی نیـوە لـەبیر کراون و پزیشک وەکـو تیمـار کـەرێک پێویـستە ئەمانـە وەک بەشـێک لەدەرمان بەکاربێنێ تابیێتە نمونەیەک بۆ ھاوکارانی خۆی)).

« تەکنەلۆژی پێشکەوتوو زۆرباشن بۆ دیاریکردنی نەخۆشیەکانی مرۆیی و دەتوانرێ ئامێری زۆر بەبەهاتر لەمەی ئێستە لەپزیشکیدا هەبێ، بەلاّم ناتوانێ جێنشینی تایبەتمەندییەکانی کەسیەتی و زاتی ڕەوشەکانی پزیشکێکی واقعی بێت. دەروونناسی دەتوانێ گەورەترین پلەی پسپۆڕی پزیشکی بێت. ئێمە مامۆستاین و نابێ ئەم ڕۆڵە بەهۆی جەزب بوون لەدونیای پزیشکیدا ڕەها بکەین».

هێشتا جارجارە لەم خەوانە دەبینم. بەزۆری لەمەدیتەیشن و هەندێجار کەلە شەقامە گەورەکاندا شۆفێری دەکەم، تەنانەت کە لەجیهانی خەیاڵدام، فیکرو دەربڕین لەزەینما دەردەکەون. بەزۆری ئەمشتانە جیاوازن لەگەڵ چەشنی بیرکردنەوەی ئاسایمداو زۆرکات لەوەختی خۆیدادێن و ئەو گرفت و کێشانەی هەمن چارە دەکەن. کەڵکیان لێوەردەگرم بۆ ژیانی ڕۆژانەم و تیمارکردنی نەخۆش.

پەیڕەوی لەخەوەکانم و دەرککردنەکانم دەکەم. کەوادەکەم کارەکانم ڕێك و ڕەوان ئەنجامدەدرێن، بەلاّم کەپەیڕەوی ناکەم دۆخە چەشنێکی ترە.

هێشتا هەستدەکەم ڕۆحە مەزنەکان لەدەورو بەرمن. دڵنیانیم بەلاّم لام وایە خەوەکانم و تێگەشتنەکانم لەژێر کاریگەری ئەواندایە.

# دوا وتــه

ئێستا ئیتر کتێبەکە کە تەواو بوو ، بەڵام چیرۆکەکە هەر بەردەوامە .
کاترین چاك بووە. ئیتر بە ئاگابووم لەگەڕانەوەی نەخۆشەکانی دی بۆ ڕابردوو . ڕێنوومابییەکانی من لەم بارەدا کۆمەڵێك هۆکاری نەخۆشی و چاك نەبونی بەدەرمانەکانی ترو دواتر ئاسان بوونی هیپنۆتیزم و دواتریش وەرگرتنی ئەم ڕەوشە بوو لەلایەن نەخۆش و هەستی خۆشم کەپێویستە ئەم ڕەوشە بێت یان نا، بووە . دوای کاترین دوانزە نەخۆشی تر لەڕێگەی هیپنۆتیزمەوە بردمەوە بۆ قۆناغەکانی ژیانی پێشویان . هیچ کام لەم نەخۆشانە تێکچونی دەماغییان نەبوو ، دووچار ‌ ‌ ‌ وەهم و گومان نەبوو بوون، هەر ڕۆژەو لەسەر بەزمێ نەبوون لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان بەشێوەیەکی بەرچاو چاك بوونەوە .

ئەم دوانزە نەخۆشە هەریەکە ڕابردوویەك و کەسایەتیەکی جیاوازیان هەبوو . خانمێکی خانەخوێی یەهودی لەکەنار ئاوی میامی ، بەڕوونی بەبیری هات کەگروپێ لەسەربازانی ڕۆمی ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ مێك پاش مەرگی حەزرەتی مەسیح لەفەلەستین دەست درێژیان کردۆتە سەری . هەر ئەو لەسەدەی نۆزدەهەم لە (نیوائۆرلئان) بەڕێوەبەری مەلها خانەیەك بوو . لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لە پەرستگایەك لەفەرەنسا دەژیاو ژیانێکی ‌ ‌ ‌ لەبەرگیشی

لەژاپۆن گوزەراندوە . جگە لەکاترین ، ئەو تەنها نەخۆشی بوو کەدەیتوانی پەیامەکان لەبەرزەخەوە بگوازێتەوە . پەیامەکانی زۆر ڕۆحانی بوون ئەویش دەربارەی هەندێ لە ڕووداوەکانی ژیانم شتی دەزانی و تەنانەت ئەشی توانی پێشبینی داهاتوو بکات . پەیامەکانی لەلایەن ڕۆحێکەوە بەتایبەتی دەهاتن و من دواجار بە وردی خەریکی کۆکردنەوەیانم . من هێشتا هەمان زانای پێشووم . هەموو باسەکانی ئەو پێویستە بەتەواوی لێکبدرێتەوەو باوەڕپێکراوبن .

ئەوانیتر لەتوانایاندا نەبوو پاش مەرگیان لەبیر بێت ، لەلاشەکانیان دەردەچوون و بەئاراستەی ڕوناکیەکە . هیچ کامیان نەیانتوانی پەیامێك یان فیکرەیەکم بدەنێ. بەلام هەموویان یاداشتی ژیانی پێشویان هەبوو . دەلاڵێکی بەهۆش ژیانێکی باش بەلام تاقەت پڕوکێنی لە ئینگلیز گوزاراندبوو . خاوەن ڕیستۆرانێ کە سڵی لەسەیارە لێخوڕین دەکردەوە بەسەر پرد یان بەناو تونێلدا ، بەبیری هات لەشارستانیەتێکی قەدیما لە ڕۆژهەڵات زیندە بەچاڵ کراوە . پزیشکێکی لاو زەبری ڕۆحی لە دەریادا بەبیر هێنا. پێشکەشکارێکی تەلەفزیۆن شەش سەد ساڵ بەر لەئێستا لە (فلورانس) ئازار درابوو . لیستی نەخۆشەکان هەر بەردەوامە .

هەموو ئەمانە ژیانی تریشیان بەبیردەهات و بەکردنەوەی دەرگای قۆناغەکانی ژیانی، پاڵنەرو هۆکارەکانی نەخۆشیەکە نەدەمان . هەر کام لەوانە ئێستا بڕوای وایە لەڕابردوودا ژیاوەو لەئایندەشدا دەژی . ئێستە ئیتر ترسیان لەمەرگ کەم بووەتەوە .

پێویست ناکات هەموان بگەڕێنەوە بۆ دواوە یان بچنە لای فالگیرو تەنانەت یۆگاش بکەن . ڕەنگە ئەوانەی پاڵنەری نائارامی و نائاسودەییان

هەیە وەها كاریٚ بكەن . بیـزانن كـەژیان زیـاترە لـەوەی كەئـەیبینین. ژیـان لەپشت پیٚنج هەستـەكەی ئیٚمەوەیـە . زانـست و ئـەزموونی نـویٚ وەرگـرە . ((كاری ئیٚمە فیٚربونە تا لەڕیٚ ی زانستەوە ببینە بونەوەریٚكی خودایی )) .

ئیتر گرنگ نیە بەلامەوە ئەم كتیٚبە چ ئاسەواریٚ لەسەر پسپۆڕیم بـەجیٚ دیٚلیٚ . ئەو زانیاریانەی خستمە بەردەستی هەمووان زۆر بەسودترە لـەكاریٚك كەدەتوانم بۆ یەك بەیەكی خەلٚكی لە عیادەكەما ئەنجامی بدەم .

هیوام وایە بەیارمەتی ئەم باسـانە ترسـتان لەمـەرگ كـەم بیٚتـەوەو ئـەو پەیامانەی دەربارەی مانای ڕاستەقینەی ژیـان خرایـە بەردەسـتان ئازادتـان بكـات تـا ژیانتـان بـە كـاملٚترین ڕەوت بەسـەربەرن و وەدوی هەماهـەنگی و ئـارامی و دەرونـی بـن و دەسـتی خۆتـان بـە عیـشقەوە بـۆ ڕووی هاوچەشنەكانیان دریٚژ بكەن .

دكتۆر ( برایان ) پزیشكێكی دەروونناسی بەناوبانگی ئەمریكییە ناوبراو بەرپرسی بەشی دەروونی زانكۆیی ( مەیامی ) بوە لە فلۆریدا . لەو یەكەم پزیشكانەیە لەرێگەی یاداشتەكانی پێشوەوە رەوشێكی چارەسەری نەخۆشی دەروونی تاقی كردەوە بەشێك لە ئەزموونە نوێكانی ئەو لەم كتێبەدا هاتوە .

ئەم توێژینەوە زانستیە لەچارەسەركردنی نەخۆشیەكاندا تا رادەیەك نوێیەو رەنگە زیاتر لە دەساڵ بەسەریا تێنەپەڕێ ئەمەش توێژینەوەیەكی زانستیە و جیاوازە لەگەڵ ئەو توێژینەوە تەقلیدیانەی دەربارەی ژیانی پاش مردن كراون . چەندەها توێری زانستی جیاواز لەبارەی چۆنیەتی هەبونی ئەم یاداشتانە خراونەتە ڕو وە توێژینەوە زانستیەكانیش لەژانرە جیاوازەكانیەوە لەم مەیدانەدا بەردەوامن و رو لەزیاد بونە .

نرخی ( ٣٥٠٠ ) دینارە